# تەنها بۆ ئافرەتانە

(لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی شەرعیە)

(بێ نوێژی، خوێنداری، سکپڕی،
ڕێگرتن لە سکپڕی، لەباربردن، منداڵبوون،
زەیستانی، شیرپێدان، لە بێ نوێژی کەوتن)

دانانی
دکتور إبراهيم طاهر معروف الرباني
پسپۆر لە پزیشکی کۆمەڵ
دکتۆرا لە دراساتی ئیسلامی

# تەنها بۆ ئافرەتان

## لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی و شەرعیەوە

(بێ نوێژی، خوێنداری، سك پڕی، ڕێگرتن لە سك پڕی، لەباربردن، منداڵبوون، زەیستانی، شیرپێدان، لە بێ نوێژی کەوتن)


دانانی

**دکتور إبراهیم طاهر معروف الرّباتي**

پسپۆر لە پزیشکی کۆمەڵ

دکتۆرا لە دراساتی ئیسلامی

# تەنها بۆ ئافرەتان

## للنساء فقط

For Female

کە زۆر بە وردی باسی ئەو کردارە فسیۆلۆژیانە دەکات کە لە ژیانی ئافرەتا
ك: بێ نوێژی وخوێنداری وسك پڕی ومنداڵبوون وشیرپێدان ولە بێ نوێژی ک
ەدرێژی باسی دوو بابەتی گرنگی تر دەکات ئەوانیش ڕێگەگرتن لە سك پڕی (
، ولەباربردنە، کە لەوانەیە ئافرەتان ڕوو بە ڕوویان ببنەوە لە تەمەنی زاوز
ەرچاوی ڕوون بێ وبزانێ چۆن مامەڵەو هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات،
تان وسوود وەرگرتنتانە. هەر لەش ساغ وسەلامەت وسەرفرازو سەرکەوتوو بز

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ
نۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا
إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ﴾(الحج:5)

﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ
شَهۡرًا﴾(الاحقاف:15)

## پێشکەشە بە

هەموو ئەو خوشکانەی دەیانەوێت بگەنە زانستی ڕاستەقینەی
پزیشـکی بۆ ئەوەی لە کردارە فسیۆلۆژی و بایۆلۆژیەکانی
خودی خۆیان بگەن، تـاوەکو ژیانی خۆیان
بە ئاراستەیەکی ڕاست و دروست
و ئاسوودەبەرەو
پێشەوەببەن

# سوپاس وپێزانین

سوپاسی خۆم ئاراستەی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەم، کە هاوکاریان کرد بۆ ئەوەی ئەم پەڕاوە بێتە چاپ کردن وبگاتە دەستی خوێنەرانی بەڕێز بەتایبەتی:

- بەڕێز مامۆستا مەلا عبد القادری ماجدی.
- بەڕێز مامۆستا مەلا عبدالرحمن ئازادی.
- بەڕێز مامۆستا مەلا تاریق نانەکەلی.

کە ئەرکی پێداچوونەوەی عەرەبی و کوردیەکان گرتە ئەستۆ،

خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده والشكر لصانع النعمة وخالقها، إليه الفضل ونطلب المزيد منه، ومنه أصل الفضل وعوده.

ونصلي ونسلم على سيد الخلق أول الأمر وبعده.

بعد: فهذا كتاب جليل وبحث دقيق فيما تمس الحاجة إليه وتعم كل مؤمن خـاف ربّه و أراد أن يسلك سبيل الهداية ولا يحيد عنه.

ذلِكَ سِفر جليل عن هدى اللِه ما يحيدْ
صاغه حبْــر طــبيب قوله رأي سديد
اســـتلُهُ مـــن كـــتب معـــتبرة
مـــن قديـــم القـــول ذكراً أو جديد
لَـــــــمْ يُخالفْ شرعنا أو طبَّنـــا
فاقبَـــلَنهُ قائـــلاً هــل مـــن مزيد
نالَ ما يحتــاج الخائف مـــن ربّهِ
مُبتغـــاه ولـــهُ حـــظ ســـــعيد

(مامۆستا مەلا عبد القادری بەحرکەیی ماجدی)

بسم الله الرحمن الرحیم

## پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ خوای گەورە کە ئادەمیزادی دروست کردووە لە ئاوێکی کەم، جوانترین شێوەی جەستەیی وبەرزترین پلەی هۆش وزانیاری پێ بەخشیوە، سەلات وسەلامی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەری خوا، کە هەموو کاروبارەکانی پەیوەست بە ژیانی ئافرەت وخێزانداری بۆ مرۆڤایەتی ڕوون کردۆتەوە، ڕەزاو ڕەزامەندی خوا لەسەر هاوەڵ ویارانی بێت.

خوێنەری بەڕێز: ئەو پەڕاوەی لەبەر دەستانە باسی چەند بابەتێکی زۆر گرنگ دەکات، ئەو بابەتانەی کە بەشێوەیەکی سروستی وخۆڕسك لە گشت ئافرەتێکی دروست ڕوودەدات، کە پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی ڕۆژانەی بە ژیانی هەموو تاکێکی ڕەگەزی مێینە هەیە هەر لە تەمەنی کەوتنە ناو بێ نوێژیەوە تاوەك شو کردنی و منداڵبوونی وشیرپێدانی جگەر گۆشەکەی، تاوەکو تەمەنی لە بێ نوێژی کەوتن. لەگەڵ ئەو بابەتانەش دوو بابەتی ترمان باس کردووە کە پەیوەندی بە ژیانی هەردوو هاوسەر و کۆمەڵگە هەیە، ئەوانیش ڕێگرتنە لە سك پڕی (بەربەستکاری)و لەربارچوون ولەباربردنە. [1]

ئەو بابەتانە بەشێوەیەکی زانستی ئاسانکراو ڕوون کراوەتەوە، بە پشت بەستان بە سەرچاوەکانی پزیشکی باوەڕ پێکراوو نوێ.

بە درێژی باسی بێ نوێژی کراوە لەبەر گرنگی ئەو بابەتە لە ژیانی کچۆڵەی تازە پێگەیشتوو، وەك یەکەم نیشانەی چوونە ناو ژیانی زاوزێی، نەمانی ئەو دیاردەیەش لە دوای تەمەنی 45 ساڵی مانای گەیشتنە تەمەنی لە زاوزێ کەوتنە، هەروەها لەبەر بوونی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ بەربەستکاری و لەبار چوون و سك پڕی وزۆربەی ڕووداوەکانی تر هەیە کە لە ژیانی مێینەدا.

سك پڕی کردارێکی سروستیە، لە هەمان کاتدا زۆر ئاڵۆزە لە ڕووی پزیشکیەوە، چەندە ملیار خانەو دەیەها هۆرمۆن تیایدا بەشداری دەکەن بە پلانێکی دارێژراو بۆ دانانی شێوەو ئاکاری ئەو بونەوەرە نوێ یە(کۆرپەلە)، هەروەها سك پڕی تاکە ڕێگەی دروستی مانەوەی ڕەگەزی ئادەمیزادە لە سەر زەوی، بۆیە بە درێژی باسی

نیشانەکان وگۆڕانکاریەکانی جەستەیی ودەرونیمان کردووە کە لەو ماوەیە درێژەدا ڕوودەدات کە کەمترینی شەش مانگە. هەروەها باسی کرداری منداڵبوون و زەیسانی کراوە.

باسێکی تێروتەسەلی بابەتی بەربەستکاری ولەبارچوون ولەبار بردنمان کردووە بە هەموو ڕێگەو هۆکارەکانی کۆن ونوێ یەوە، لەگەڵ لایەنە باشەکان (پۆزەتیڤ) و ماکە خراپەکان (نیگەتیڤەکان) ی هەریەکێك لەو ڕێگایانە.

باسی شیری دایك و سوودەکانی بۆ منداڵەکەو دایکەکە خۆی، باسی جیاوازی ئەو شیرە لەگەڵ شیری ووشك کراوە کراوە بە دریژی، تاوەکو دایکان ئاگادار بن کەوا هیچ شیرو خواردنێکی تر نیە شوێنی ئەو دیاریە خوایی یە بگرێتەوە.

لە کۆتایی بابەتەکانەوە باسێکی تەواوی کرداری لە بێ نوێژی کەوتنمان کردووە لەگەڵ نیشانەکانی وکاریگەری لەسەر ئافرەت ودەروبەری.

**هۆکاری هەڵبژاردنی ئەو بابەتانە:**

1- زۆربەی خەڵکی ئێمە بە هەردوو ڕەگەزەوە شارەزاییەکی زانستیانەیان نیە دەربارەی ئەو کردارە فسیۆلۆژی وبایۆلۆژیانەی ڕوودەدات لە ژیانی ئافرەت، کە زۆربەشیان پەیوەندی بە ژیانی نێرینەوەش هەیە، چونکە ئافرەتان یان دایك یان خوشك یان هاوسەر یان خزمی نزیکی پیاوانن، کەواتە لە نزیکەوە یان لە دوورەوە بەم بابەتانەوە پەیوەستن، بۆیە بە پێویستم زانی کە بە درێژی باسیان بکەم لەگەڵ وردەکاریەکانی، چونکە لای هەندێ کەس وایە ئەوانە شتی زۆر سادەو ساکارن پێویست بەوە ناکات هیچی دەربارەیەوە بزانێ، یان هەر گرنگی پێ نادات تاوەکو نەکەوێتە ناو یەکێك لە کێشەکانی پەیوەستە بەو بابەتانەوە.

2- لەم چەند ساڵەی دوایی بەکارهێنانی شیری ووشك و ئەنجامدانی بەربەستکاری ولەباربردن زۆر بڵاو بوونەتەوە لە زۆربەی وولاتانی جیهان بەتایبەتی وولاتانی ڕۆژ ئاوا، بەربەستکاری ولەباربردن شێوەیەکی فەرمی وحکومی وەرگرتووە، پێشکەوتووترین هۆکاری بۆ بەکاردەهێنرێ تاوەکو خەڵکان زیاتر

بەدەمیەوە بچن، ئەو دوو خاڵە وای کردووە کەوا بەربەستکاری ولەباربردن بە کردارێکی سرووستی وئاسان تەماشا بکرێت، پێویستی بەوە نەبێت کە بڕیاری پزیشك وفەتوای زانایانی شەرعی بۆ بدرێت. بۆیە دەربارەی ئەو دوو بابەتە چوومەتە ناو قووڵایی و وردەکاریەکان وجۆرەکانی، لایەنە باش وخراپەکانی، پاساوی ئەنجامدانیانیان لە ڕووی پزیشکی وشەرعیەکەم ڕوون کردۆتەوە، تاوەکو خەڵکان بە شێوەیەکی گشتی، بەتایبەت تر پزیشکە بەڕێزەکان هەروا بە ئاسانی بڕیاری بەربەست دانان و لەبارچوون نەدەن، هەروەها زانایانی ئاینی وموفتیەکانیش بە شێوەیەکی زانستی میکانیزمی ئەو دوو بابەتە بزانن تاوەکو ئەگەر داوای فتوایان لێ کرا بەشێوەیەکی بەرچاو ڕوونی فەتوا بدەن، یان بەڕاوێژ کردن لەگەڵ پزیشکی پسپۆڕی نەخۆشیەکە، بابەتەکە تاوتۆ بکەن تاوەکو بگەنە بڕیارێکی ڕاست ودروست وتووشی گوناهو تاوانیش نەبن بەهۆی فەتواکەیان، چونکە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (هەر کەسێك فەتوایەکی وەرگرت وتووشی بە گوناهو تاوان بوو ئەوا گوناهو تاوانەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە فەتواکەی بۆ داوە بەبێ زانیاری).((ومن أفتي بغير علم فإنّما إثمه على من أفتاه))[1] ئەبو داود و ئیبن ماجه ڕوایەتیان کردووە.

داواکارم لە خوای گەورە کە ڕێگای ڕاست ودروستمان پێ نیشان بدات، هەموو لایەکیش سەرکەوتوو سەرفراز ولەش ساغ وسەلامەت بکات، ئەو ماندوو بوونەشمان بەخێر بۆ بنووسێ بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی، بیخاتە سەر تەرازووی چاکەکانمان.

وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين.

د. إبراهيم طاهر معروف
هەولێر 2009/1/15

1 ــ ناصف، منصور علي، التاج الجامع للأصول، كتاب العلم، باب: في آداب العلم، 73/1.

# بەشەكانی ئەم پەڕاوە

بەشی یەكەم: بێ نوێژی وخوێنداری- خوێن بینین (الحیض والاستحاضة).

بەشی دووەم: سك پڕی- دوو گیانی (الحمل).

بەشی سێیەم: ڕێگرتن لە سك پڕی- بەربەستكاری (العزل- منع الحمل- تنظیم الأسرة).

بەشی چوارەم: لەبارچوون ولەباربردن(الإسقاط والإجهاض).

بەشی پێنجەم: منداڵبوون وزەیستانی وشیرپێدان (الولادة والنفاس والرضاعة).

بەشی شەشەم: لە بێ نوێژی كەوتن (سن الیاس).

# بەشی یەکەم

## بێ نوێژی وخوێنداری (الحیض والاستحاضة)

## (Dysfunction Uterine Bleeding- DUB- Menestruation)

باسی یەکەم: بێ نوێژی لەڕووی پزیشکی وشەرعیەوە

باسی دووەم: خوێنداری- خوێن بینین

# باسی یەکەم

## بێ نوێژی لەڕووی پزیشکی و شەرعیەوە

بەندی یەکەم: بـــێ نوێژی لەڕووی پزیشـــکی.

برگەی یەکەم: پێناسەی بێ نوێژی وسووڕی مانگانەی ئافرەت.

برگەی دووەم: گرنگی بێ نوێژی.

برگەی سێیەم: ماوەی بێ نوێژی( مدة الحیض ).

برگەی چوارەم: بڕی خوێنی بێ نوێژی.

برگەی پێنجەم: ڕەنگی خوێنی بێ نوێژی.

برگەی شەشەم: چۆنیەتی ڕوودانی کرداری بێ نوێژی.

بەندی دووەم: نیشـانەکانی پێش بێ نوێـژی.

برگەی یەکەم: نیشانەکانی جەستەیی.

برگەی دووەم: نیشانەکانی دەرونی.

بەندی سێیەم: بێ نوێژی لەڕووی شەرعیەوەوە

برگەی یەکەم: واتـای بێ نوێژی.

برگەی دووەم: ناوەکانی بێ نوێژی.

برگەی سێیەم: گرنگی بێ نوێژی.

برگەی چوارەم: کاتەکانی هاتن وبەسەرچوونی بێ نوێژی.

برگەی پێنجەم: ژمارەی ڕۆژەکانی بێ نوێژی.

## باسی یەکەم: بێ نوێژی لەڕووی پزیشکی وشەرعیەوە.

لەبەر گرنگی بابەتی بێ نوێژی بە درێژی باسی دەکەین لە ڕوانگەی پزیشکی و شەرعیەوە.

### بەندی یەکەم: بێ نوێژی لەڕووی پزیشکی.

### بڕگەی یەکەم: پێناسەی بێ نوێژی و سووڕی مانگانەی ئافرەت.

**یەکەم: بێ نوێژی.**

ئەم خوێنەیە کە لە دامەنی ئافرەت دێتە خوارەوە پاش گەیشتنە تەمەنی پێگەیشتن، هەر28 ڕۆژ جارێك ڕوو دەدات.[1]

**دووەم: سووڕی مانگانەی ئافرەت (العادة الشهرية - Menstrual cycle).**

هاتنی بێ نوێژی یەك لە دوای یەك، دەست پێ دەکات لە سەرەتای بێ نوێژی تاوەکو سەرەتای ئەو بێ نوێژیەی بە دواوەی دێت، ماوەکەشی 21-35 ڕۆژە، لە زۆربەی ئافرەتان28 ڕۆژە.[2] (لە هەندێ ئافرەتیش21-40).[3]

### بڕگەی دووەم: گرنگی بێ نوێژی.

1- نیشانەیەکە بۆ دەست پێکردنی ژیانی زاوزێی ئافرەت.

2- نەمانی بێ نوێژی، نیشانەی کۆتایی هاتنی منداڵ بوون و تەمەنی زاوزێ یە.

3- ڕێکوپێکی بێ نوێژی مانای ساغی وسەلامەتی کۆ ئەندامی زاوزێ یە، پشێوی بێ نوێژی بە واتای ناتەواوی کۆئەندامی زاوزێ وکۆئەندامەکانی ترە، یان واتای ناتەواوی باری دەرونی ئافرەتە.

---

*1— Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 788.*
*2— Stuart.Combell & Ash.Manga. Gynecology by ten teachers. P: 40.*
*3— Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 788.*

4- وەستانی بێ نوێژی یەکەمین نیشانەکانی سك پڕی یە(دوو گیانی).

5- پشێوی بەردەوام لە بێ نوێژی سەردەکێشێ بۆ نەزۆکی. لەکاتی سك پڕی هاتنی خوێن بە مانای لەبارچوونە.

## بڕگەی سێیەم: ماوەی بێ نوێژی (مدة الحیض).

ماوەی بێ نوێژی وسنووری مانگانە لە ئافرەتێکەوە بۆ ئافرەتێکی تر جیاوازە، لە هەمان ئافرەتیش لە تەمەنی زاوزێ لە ماوەیەك بۆ ماوەیەکی تر دەگۆڕێ. بڕو هێندەی خوێنەکەو ماوەکەی لەسەرەتای پێگەیشتن جیاوازە لەگەڵ تەمەنی تەواو پێگەیشتن، کەم دەبێتەوە پێش تەمەنی لە زاوزێ کەوتن.

بەشێوەیەکی گشتی لە تەمەنی زاوزێ بێ نوێژی ڕێکە لەزۆربەی ئافرەتان،خۆیان کاتەکەی دەزانن، هەرکاتێکیش گۆڕانکاری ڕوویدات ئەوا بە ئاسانی هەستی پێدەکەن. ماوەی بێ نوێژی2-8 ڕۆژە، بەشێوەیەکی گشتی4-6 ڕۆژە، یان5± 2 ڕۆژە.

## بڕگەی چوارەم: بڕی خوێنی بێ نوێژی (کمیة دم الحیض).

ئەویش جیاوازە لە ئافرەتێك بۆ ئافرەتێکی تر. ئەوەی لای ئافرەتێك ئاسایی یە بۆ ئافرەتێکی تر نا ئاسایی یە. ئەو خوێنەی کە دێتە خوارەوە لە کاتی بێ نوێژی لە نێوان30- 80 میلیلترە.[1]

## بڕگەی پێنجەم: ڕەنگی خوێنی بێ نوێژی (لون دم الحیض).

ڕەنگی خوێنی بێ نوێژی ڕەشە، هەرگیز نامەیێ ونابەستێ گەر بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە.[2] ئەگەر خوێنەکە مەیی وبەستای و ڕەنگەکەی گەر سوور بوو ئەوە خوێنی بێ نوێژی نیەو خوێنەکی تری نا ئاسایی یە.

---

*1 -Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 788*

*— Stuart.Combell & Ash.Manga . Gyaecology by ten teachers. P: 44*

*2— .Dullen Bach. Text book of Endometrial pathology. P: 7 3*

## بڕگەی شەشەم: چۆنیەتی ڕوودانی کرداری بێ نوێژی.

منداڵدان وهێلکەدان ومەمکی ئافرەت، بگرە هەموو کۆ ئەندامی زاوزێی دەست بە گۆڕانکاری دەکەن بە هۆی زیادبوون وکەم بوونی بڕو هێندەی ژمارەیەك لە هۆرمون. لێرەوە ئێمە تەنها باسی گۆڕانکاریەکانی منداڵدان دەکەین، تاوەکو بزانین کرداری بێ نوێژی چۆن ڕوودەدات.

ڕووی ناوەوەی منداڵدان داپۆشراوە بە چینە خانەیەکی تەنك، کە ئەستووریەکەی لە 2/1 میلیمەتر تێ ناپەڕێ. ژمارەی وقەبارەی موو لوولەکانی خوێن وگلاندەکانی تیایدا زۆر کەم وسادەیە، بەڵام کاتێ کرداری بێ نوێژی دەست پێدەکات ئەم چینە خانەیە بە سێ قۆناغدا دەڕوات.

1 - قۆناغی گەشە کردن (مرحلة النمو- Proliferative phase).

لەو قۆناغەدا چینی ناوەوەی منداڵدان دەست بە گەشە کردنێکی خێرا دەکات، ئەستووری لە 2/1 میلیمەتر زیاد دەکات بۆ 5 میلیمەتر، واتە 10 جارانی خۆی لێ دێت. لە هەمان کاتدا ژمارەی وقەبارەی گلاندەکانی تیایدا زۆر زیاد دەکات و شێوەی لوولەیی وەردەگرن، ژمارەی وقەبارەی موو لوولەکانی خوێنیش بە شێوەیەکی سەرسووڕ هێنەر زیاد دەکات تاوەکو وای لێ دێت شێوەی لوولپێچ وەردەگرن لەبەر زۆری وچڕی وپڕی. هەروەها جوولەی منداڵدانیش زیاد دەکات، جوولەی خۆشی و ڕاکێشانی پێوە دیار دەبێت.[1]

هۆی ئەو گۆڕانکاریانەش بریتیە لە ڕژانی هۆرمونی ئیسترۆجین کە لە چیکلدانۆچکەی گراف لەناو هێلکەداندا دێت، ئەو هۆرمونە بە هۆرمونی هەڵچوونی ئارەزووی جینسی ناسراوە، ئەو هۆرمونە، هۆرمونی مێینەیە لەڕووی دیاری کردنی شێوەو دیمەن وسیفەت وهەڵسوکەوتی ئافرەتەوە. مەمکەکان گەورە دەکات، چەوری لە سەر سنگ و کلۆت و سمت و ژێر پێستە کۆدەکاتەوە تاوەکو ئەو

*1— Stuart.Combell & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 35.*
*- Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 789.*
*- Leslie.J.Degroot. Endocrinology. P : 3/194.*

شوێنانەی نزم دیارن پڕیان بکاتەوەو لە بەرچاو جوان دیار بن.

ئەو گۆڕانکاریەی باسمان کردن لە چینی ناوەوەی منداڵدان ئەویش بەهۆی کاریگەری ئەو هۆرمونەیە تاوەکو ئامادەی بکات بۆ وەرگتنی هێلکەی پیتێنراو.[1] هەروەها وا دەکات لە چینی ناوەوەی دیواری زێ کە هەندێ شلەی ترشەلۆك دەریدەن تاوەکو ئەو میکرۆبانە بکوژێت کە لەوانەیە هێرش ببەنە سەر سپێرم (تۆی نێرینە) لە کاتی تێپەربوونی بەناو کۆئەندامی مێینە. ئەو هۆرمونە سەر سووڕ هێنەرە هەر بەو کارانە ناوەستێت بەڵکو وادەکات مێینە ئارەزووی بەرەو لای هاوسەرەکەی بڕوات ولەبەر چاوی خۆشەویست بێت، کاریگەریشی لەسەر هەڵسوکەوتی ئافرەتیش هەیە بە زیاد کردنی ئارەزووی خۆ جوان کردن ورازاندنەوەو لەنجەو لاری. لە هەمان کاتدا ئەو بڕە هۆرمۆنەی نێرینە (تیستۆستیرون) کە لە ئافرەتدا هەیە لە ڕژێنە گلاندی سەر گورچیلەوە دێت، ئەویش هۆکارە بۆ جوولاندنی ئارەزووی جینسی ئافرەت، تاوەکو جووتبوون ڕووبدات و هێلکە بگاتە ئاواتی خۆی، ئەو گۆڕانکاریانەی لەناو منداڵدان ڕووی داوە بە فیڕۆ نەڕوات.

2ـ قۆناغی دەردان (مرحلة الإفراز Secretary phase).

گەشەی منداڵدان لەو قۆناغە زیاد دەکات. چینی ناوەوەی منداڵدان زیاتر توندو تۆڵ دەبێت ودیواری منداڵدان شێوەی ئیسفەنجی وەردەگرێ. هۆی ئەو گۆڕانکاریەش بریتیە لە ڕژانی هۆرمونی پرۆجیسترون لە چیکڵدانۆچکەی گراف، دوای دەرچوونی هێلکە ڕێژەی ئەو هۆرمونە زیاد دەکات.[2]

چینە لینجەکەی ملی منداڵدان ناهێڵێ سپێرم بچێتە ناو منداڵدان لە سەرەتای دەست پێکردنی بێ نوێژی تاوەکو چەند ڕۆژێك پێش هاتنە خوارەوەی هێلکە، لەو

---

1ـ النطفة الأمشاج: أي البويضة الملقحة *"Fertilized ovum"*.

2ـ *Stuart.Combell & Ash.Manga. Gyaecology by ten teacher. P: 42.*

*- Frances.S.Greenspan & Gordon.j. Basic&Clinical Endocrinology. P: 441.*

کاتەدا گۆڕانکاری زۆر لە منداڵداندا ڕوو دەدات بە هۆی هۆرمونی ئیستروجین، لەوانە زیاد بوونی دەردانی ماددەی چڵمنی (المخـاطي– mucous)، کەم بوونەوەی لینجی(viscosity) زێ، دەزووە لیفیەکان ڕوو لە سەروو دەکەن تاوەکو بتوانن بە ئاسانی سپێرم بەرەو سەرەوە پاڵ بدەن.[1]

هۆرمـونی پرۆجیـسترون بـەهۆرمونی سـك پـڕی ناسـراوە، چـونکە منداڵـدان ئامادەدەکات بۆ وەرگرتنی هێلکەی پیتێنراو. مەمکەکان گەشە پێدەکات بۆ کاتی منداڵبوون. هەروەها کار لە گورچیلەکان دەکات بۆ کەم کردنـەوەی دەرهاویـشتنی ئاو خوێ بۆ پێویستی کۆرپەلـەی داهـاتوو. جوولـەی منداڵـدان دەگۆڕێ لـە کێش کردن و خۆشی بـۆ جوولەیـەکی هـێمن و نـەرم وقـوول ئـەو جـۆرە جوولەیـەش دوو سوودی هەیە، یەکەمیان: پێش پیتێن هاوکاری پاڵـدانی سـپێرمەکانە بـۆ سـەرەوە، دووەمیان: دوای پیتێنیش هاوکارە بۆ ئەوەی هێلکەی پیتێنراو بتـوانێ بـە ئاسـانی خۆی بە دیواری نـاوەوەی منداڵـدان هەڵواسـێ.[2] کەواتـە ئـەو هۆرمونـە کۆئەنـدامی زاوزێ وئەندامەکانی تری لـەش ئامـادە دەکـات بـۆ کـردای پیتـێن ودروسـت بـوونی کۆرپەلە.

3- قۆناغی هاتنە خوارەوەی خوێن (مرحلة الطمث - Luteolysis).

گەر ویستی خوای گەورە وابوو پیتێنی هێلکە ڕووی نەدا، ئـەوا دوای 14 ڕۆژ لـە هاتنـە خـوارەوەی هێلکـە ئـەوا ئـەو قۆناغـە دەسـت پێـدەکات. ئـەو هـەموو ئامادەکاریەی کرابوو لەناو منداڵدان، بڕو ئاسـتی ئـەو هۆرمونانـەی نـاو زەردەتـەنی هێلکەدان دەڕژان کەم دەبنەوە، ئافرەتەکە لە ڕووی دەرونیەوە تووشـی پـشێوی و نارەحەتی دەبێت، هەست بە دڵ تەنگی و ژیانێکی تەنهایی دەکات.

کاتێ هێلکەدان ئاگـادار کـراوە، کـە هێلکـە نـەپیتێنراوە ئـەوا ڕێـژەی هۆرمـونی پرۆجیسترون یەکسەر دادەبەزێت، بەمەش بۆڕیەکانی خـوێن بەشـێوەیەکی وا تونـد

---

1 _ *Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 855.*

2 - *Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 855.*

تەسك دەبنەوە خۆراك قەدەغە دەكەن لە چینی ناوەوەی منداڵدان تاوەكو لەبارێك هەڵدەوەشێتەوەو خوێنەكی ڕەشی تاریك دێتە خوارەوە لەگەڵ پارچە هەڵوەشاوەكانی چینی ناوەوەی منداڵدان.

ئەو خوێنە پیسە دەبێتەستێ و پەیت دەبێت، پاش ماوەیەكی كەم پێش هاتنە دەرەوەی لەناو منداڵدان ئینزیمەكی تایبەت دەڕژێتە سەری بەناوی(توێنەرەوەی ڕیشاڵە لیفیەكان). لە ئەنجامی ئەوەدا خوێنەكی ڕەش دێتە خوارەوە كە هەرگیز نامەیت ونابێستێ هەرچەندە بۆ ماوەی چەند ساڵێك جێ بهێڵدرێ.[1]

لێرەوە دەپرسین ئایا سروشت ئەو كردارە جوان و ڕێك وپێكەی وا دارشتووە و ئەو هۆرمونەی وا ئاراستە كردووە، كە ئەو كارە گرنگ و سەرسووڕ هێنەرانە ئەنجام بدەن، یان خودای گەورە ڕێگەی بۆ دیاری كردوون، ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ طه:50.

## بەندی دووەم: نیشانەكانی پێش بێ نوێژی( الأعراض قبل الحیض- Premenstrual Syndrom-PMS )

بریتیە لە كۆمەڵێك نیشانەی جەستەیی ودەروونی وعاتیفی لەگەڵ سووڕی مانگانە دیار دەكەون، چەند ڕۆژێك پێش هاتنە خوارەوەی خوێن زیاد دەكات، لەگەڵ هاتنە دەرەوەی خوێنەكە پلە پلە كەم دەكات.

زیاتر لە150 نیشانەی جیا جیا تووشی ئافرەتان دەبێت لە كاتی بێ نوێژی، بەم هۆكارانەی خوارەوە دەناسرێتەوە:[2]

1- نیشانەكان لەگەڵ بەرەو پێشەوە چوونی سووڕەكە زیاد دەكات.

2- نیشانەكان لەگەڵ هاتنە دەرەوەی خوێنەكە پلە پلە كەم دەكات، لە ڕۆژی

---

*1– Stuart.Combell & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 43*
*-Kenneth. Principle & Practice of Endocrinology. P: 796.*
*2– Stuart.Combell & Ash.Manga .Gyaecology by ten teachers. P: 61.*

سێیەم زۆربەی نیشانەکان وون دەبن.

3- لەوانەیە هەندێك نیشانە بۆ ماوەیەکی زیاتر بمێنێ، دوای حەوت ڕۆژ بەتەواوی وون دەبن.

4- نیشانەکان دەبێت لە سێ سووڕی یەك لە دوای یەکەوە هەبێت.

5- نیشانەکان بگاتە پلەیەکی وا لە توندی لە کاروباری ڕۆژانەی سست وبێ توانای بکات.

ئەگەر نیشانەکان ئەو سیفەتانەی نەبوو کە باسمان کردن ئەوا بە نیشانەی بێ نوێژی ناژمێردرێن، بەڵکو ئەگەری نەخۆشی تری جەستەیی و دەروونی لێ دەکرێت، وەك: نەخۆشی خەمۆکی(الكآبة).[1]

### بڕگەی یەکەم: نیشانەکانی جەستەیی (الأعراض الجسدية).

کۆئەندامی زاوزێی بەشێوەیەکی گشتی ئاوسانی پێوە دیارە، ئافرەت هەست بەم شتانە دەکات: سستیەکی گشتی، ئازارو قورسایی لە خوارەوەی سکی و پشتی، پاڵەپەستۆ لە سەر میزڵدان، گرژیەکی توند لە سەرووی ڕان هەڵدەکشێ بە ئاراستەی خوارەوەی ڕان و دوایی بۆ ناوەوەی لەش. ئەو نیشانانەش بە هۆی گرژبوونەوەی ماسولکەکانی منداڵدانە کە هەوڵ دەدات پاشماوەکان فڕێ بداتە دەرەوە. لەگەڵ ئەو گرژبوون و خاوبوونەوەی ماسولکەکانی منداڵدان هەست بە ئازارێکی کەم دەکات، دوایی بەرە بەرە زیاد دەکات. ڕژێنەی چەوری زیاد دەبێت، لەهەندێ ئافرەت دەنکۆڵەی گەنجی (حب الشباب- Acne vulgaris) و تامیسکەی سەر لێو (عقبول على الشفاه- Herpes simplex) پەیدا دەبێت، هەست بە ماندوو بوون و سەریەشە دەکات، زیاد بوونی لیك و پشێوی هەرس و دڵ تێهەڵچوون و ئارەزووی ڕشانەوە، زۆر جار سکچوونەکی سووکی تووش دەبێت (Abdominal cramp). لێدانی دڵ زیاد دەکات، دەنگی دەگۆڕێ، ڕوخساری سوورو زەرد هەڵدەگەڕێ، جۆخینەیەکی(ماك) شینی کاڵ لە ژێر چاوی پەیدا دەبێت. مەمکەکان

1- *Stuart.Combell & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 62*

پـڕ وتونـد بـەئازارن دەبـن(Mastalgia)، لەوانەیـە تووشـی شـەقە سـەر بێـت، پاڵەپەستۆی ناو چاوی کەم دەبێـت بـەهۆی بـەرز بوونـەوەی ئاسـتی هۆرمونـەکانی ئیسترۆجین و پرۆجیسترون و ئەندرۆجین، ئاوسانی کۆرنیـەی چـاوو دروسـت بـوونی پشێوی لە بینین.[1]

هەرچەندە بێ نوێژی بە کردارێکی فسیۆلۆژی ئاسـایی دادەنرێ، بـەڵام زۆر جـار ئافرەت تووشی کەم خوێنی دەکات بەتایبەتی ئەگەر بڕی خوێنەکە و ماوەکەی زۆر بوو. بەمەش لێدانی دڵ زیاد دەکات، پەستانی خوێن کەم دەبێت، هەسـت بـە سـەر سووڕەو بێ هێزی و تەمەڵی دەکات.

پلەی گـەرمی لـەش دادەبـەزێ، چـونکە کـرداری زیندەچـالاکی کـەم دەبێتـەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی ووزە دەرپـەڕاندن.

ئەو گۆڕانکاریانەی لـە شـانەکان ڕوو دەدات ئەمانـەن: فڕێـدانی چـینی نـاوەوەی دیـواری منداڵـدان، بەمـەش منداڵـدان دەڕوشـێت و کـەمێك زامـدار دەبێـت، چـینە خانەکانی ژێرەوەی ئەو چینە تەنکتر دەبێت، لە هەمان کاتـدا ڕژانـدنی ترشـەڵۆك و ماددە پاککەرەوەکانی نـاو زێ کـەم دەبێتـەوە، بەمـەش میکرۆبـەکان دەتـوانن بـە ئاسایی هێرش بۆ کۆئەندامی زاوزێ بەرن و تووشی هەوکردنی بکەن. لەگـەڵ بـوونی خوێنی پیس لەناو ئەو کۆئەندامە، کە وەك ناوەندێکە بۆ گەشەی میکرۆبات ئەگەری تووش بوون بە هەوکردن زیاد دەکات.[2]

هەروەها چالاکی ڕژێنەگلاندەکان کەم دەبێتەوە، بەمـەش زۆربـەی ئۆرگانـەکانی لەش چالاکیان دادەبەزێت.[3]

---

*1_ Stuart.Combell & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers.*
*- Kenneth . Principle& Practice of Endocrinology. P: 1577.*
2_ کنجو، خالص، للطب محراب الإيمان، 1/78-80.
*3_ Stuart.Combell & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 62.*

## بڕگەی دووەم: نیشانەکانی دەروونی(الأعراض النفسية التي ترافق لحيض).

پشێوی دەرونی لە زۆربەی ئافرەتان دیاردەکەوێت کە خۆی دەنوێنێ لە: هەست کردن بە دڵ تەنگی، بێ هێزی، نەفەس تەنگی، لەش قورسی، گۆڕانی مەزاج وئارەزوو، هەڵچوون، گۆڕینی هەڵوێست بەبێ بیر کردنەوە. زوو تورە بوون بەبێ بوونی هۆکارێکی تایبەت، سەر یەشەیەکی توند، ژیان لای ئەو تامی نیە وزۆر جار دەست بە گریان دەکات.

ئەو نیشانانە ئاساین، بەڵام ماوەکی کورت پێش هاتنە خوارەوەی خوێن زۆر جار ئەو نیشانانە زیاد دەکات وتەزووی گەرم بە لەشیدا تێدەپەڕێت وای لێدەکات ڕقی لە خەڵکانی دەوروبەری بێتەوە، هاوار بکات بە سەریاندا، کە پێشتر ئەو جۆرە هەڵویستانەی نەبووە.[1]

ئەو نیشانانەش وا لە ئافرەت دەکات کە باری تەندروستی نا ئاسایی بێت، کەم ئافرەتیش هەیە هەندێك لەو نیشانانەی نەبێت. ئەو گۆڕانکاریانەش مانگێ جارێك ڕوودەدات مەحالە کار لە هێزی دەرونی وبیرو هۆش وجەستەی ئافرەت نەکات و تووشی جۆرێك لە پشێوی لاسەنگی نەکات، وەك: خاو بوونەوەی کۆ ئەندامی دەمارو هێزی دەرونی، ناڕێکی وکەم بوونەوەی ئاستی حوکم وئیختیار کردن، دەرچوونی هەندێ گوتەو کرداری خۆنەویست. ئەوەش هۆکارێکە لەو هۆکارانەی کە بوونەتە هۆی ئەوەی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بڕیاری تەڵاقدانی لە کاتی بێ نوێژی ئافرەت بەتاڵ کردۆتەوە.

ئەو گۆڕانکاریانە لە ئەنجامی بەرزبوونەوەیەکی خێرای ئاستی ژمارەیەك لە هۆرمۆنەکانی جینسی و ئۆرگانیە، وەك: هۆرمونی ئیسترۆجین، پرۆجیسترۆن، ئەندرۆجین، پرۆلاکتین، پاراثۆرمون، رینین، ئەلدۆستیرون، کە ڕژێنە گلاندەکانی ژێرمێشك و سەر گورچیلەو دەرەقی و هێلکەدان وزۆری تر تیایدا بەشدارن.[2] بەڵام

---

1ــ فاخوري ، موسوعة المرأة الطبية، ص95.

2ــبۆ شارەزایی بوون لە کاری ڕژێنە گلاندەکان وچالاکی وکاریگەری هۆرمونەکانی جینسی و هۆرمونەکانی تری لەش بڕوانە کتێبی (پیاوان و ژنان تەواوکاری نا یەکسان) دانەر.

کاتێ پیتێنی هێلکە ڕووی نەدا ئەوا ئاستی ئەو هۆرمونانە بە خێرایی دادەبەزن، کارەساتێك لە چینی ناوەوەی دیواری منداڵدان وزەردەتەنی ناو هێلکەدان و زۆربەی بەشەکانی کۆ ئەندامی زاوزێ وبگرە هەندێك لە ئەندامەکانی تری لەش ڕوو دەدات.

هەندێ لە زانایان هۆکاری بەشێك لەو نیشانانە دەگەڕێننەوە بۆ دروست بوونی لا سەنگی لە نێوان هۆرمونە جینسیەکانی ستیرۆیدی و ڕێژەی ماددەی سیرۆتۆنین لە ناو کۆئەندامی دەمار.[1]

ئارەزووی جینسی ئافرەت بۆ نزیك بوونەوە لە پیاو، ئارەزووی کرداری جینسی کەم دەبێتەوە، بە پێچەوانە ئارەزووی تەنهایی و ئاسوودەیی دەکات. ئەمەش لەبەر دابەزینی ئاستی هۆرمونی تیستۆستیرونە لە ناو خوێن. هەروەك باسمان کرد کەوا کۆئەندامی زاوزێ بەگشتی لە بارێکی نا ئاسایی و زامدارە بۆیە کرداری جینسی زیانی زۆرە و کارێکی ئاسایی نیە، هەر بۆیەش شەریعەتی ئیسلام قەدەغەی جووتبوونی کردیە لەو ماوەیەدا.

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ﴾البقرة:222.

ئەو نیشانانە کاتین و بەسەر دەچن و هیچ شوێنەوارێکی خراپ بەجێ ناهێڵن، ئافرەتەکە بۆ دۆخی تەندروستی دروستی جارانی دەگەڕێتەوە. مەرجیش نیە ئەو نیشانانەی باسمان کردن هەر هەموویان لە ئافرەتان دیار بکەون، بەڵکو بەدەگمەن هەموویان دیار دەکەون لە یەك ئافرەتدا. هەیە تەنها تووشی بەچەند نیشانەیەکی ئاسایی دەبێت بە گوێرەی باری جەستەیی و دەروونی خۆی، هەیانە تەنها هەست بە هاتنە خوارەوەی خوێن دەکات بە بێ دیارکەوتنی هیچ نیشانەیەکی تر.[2]

---

*1– Stuart & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 61.*

2ـ ماري كلود، دليل المرأة الطبي في الصحة والمرض، ص52. وفاخوري، موسوعة المرأة الطبية، ص94.

## بەندی سێیەم: بێ نوێژی لەڕووی شەرعیەوە

### بڕگەی یەکەم: واتای بێ نوێژی

أ- بێ نوێژی لە زمانەوە:(حیض: الحَیضُ: ووشەیەکی ناسراوە. تحیض حیضاً ومحیضاً والمحیض: لەوانەیە ناو بێت یان چاووگ. کۆیەکەی: الحائض حوائض وحُیّض. الحَیضَة: هاتنە خوارەوەی خوێنە.الحِیضَة: خودی خوێنەکەیە، والحیاض: خوێنی بێ نوێژیە. المحیض: جێگاو شوێنی هاتنە خوارەوەی خوێنە).[1]
المحیض: لای سەرجەمی زانایان یەکسانە لەگەڵ الحیض، گوتراوە کاتەکەیەتی، گوتراوە شوێنەکەیەتی، گوتراوە: ئەو ناوە هاتووە لەبەر پیسی خوێنەکەو ئازارەکەی. لە کاتی بێ نوێژی، بۆ پیاو تەنها شوێنی هاتنە دەرەوەی خوێنەکە قەدەغەیە، نەوەك شوێنەکانی تری لەش.[2]

ب- بێ نوێژی لە ڕووی زاراوەییەوە(الحیض إصطلاحاً)

1- ئەو خوێنەیە کە لە دامەنی ئافرەت دێتە خوارەوە، لە ئەنجامی نەخۆشی یان منداڵبوونەوە نیە، ڕەنگی ڕەشی تۆخ وتێرە، گەرمەو بە ئازارە (محتدم، لذاع).[3]

2- خوێنێکی پیسە ونەفسی پاك ودروست لێی دوور دەکەوێتەوە، لە دامەنی ئافرەت دێتە خوارەوە ولە ئەنجامی نەخۆشیەوە نیە.[4]

3- ناوێکە بەو خوێنە دەوترێت کە لە منداڵدانی ئافرەت دێتە دەرەوە لە کاتێکی دیاری کراو، لە ئەنجامی منداڵبوونەوە نیە، کە شتێکی سروشتیە لە کچەکانی نەوەی ئادەم.[5]

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 419/3.
2ـ العسقلاني، ابن الحجر، فتح الباري في شرح البخاري، 518/1.
3ـ البغا، مصطفى دیب، التهذیب في أدلة متن الغایة والتقریب - متن أبي شجاع، ص36.
محتدم: گەرم، لە گەرمەو ترچەی نیوەڕۆ هاتووە. ولذاع: بە ئازار.
4ـ النووي، أبو زکریا، سراج الوهاج على متن المنهاج، شرح الشیخ محمد الغرامراوي، ص13. والجرجاني، أبو الحسن، التعریفات، ص56.
5ـ المقدسي ، ابن القدامة، المغني، 306/1.

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە عائیشەی ﷺ فەرموو کاتێ بێ نوێژی بوو لە کاتی حەجدا: ((ئەوە شتێکە خوای گەورە لەسەر کچەکانی ئادەمی نوسیووە)). ((هذا شيء كتبه الله على بنات أدم)).[1]

**بڕگەی دووەم: ناوەکانی بێ نوێژی (أسماء الحيض).**

1- هاتنەخوارەوە(السيل): لە بنچینەوە بە واتای ڕۆیشتن هاتنەخوارەو ڕێگە گرتنەبەر دێت. هەروەك موبەرەد دەڵێ: ئەگەر ئاو زیاد بکات وهەڵسێ پێی دەڵێن (حاض السيل).[2] ئیبن حەجەر لە کتێبی(فتح الباري شرح البخاري) دا دەڵێت: لە داب ونەریتەوە بەو خوێنە دەڵێن کە لە کاتی تایبەت لە شوێنی تایبەت دێتە خوارەوە.[3]

2- خوێن و نیکاح(الطمث): طَمِثَتُ المرأة تَطْمَثُ طَمْثاً، وطَمَثَت تطْمُثُ، بالضم طَمْثاً وهي طامث: حاضت.

فەرا (الفراء) دەڵێت[4]: الطمث: مانای خوێنە. بە واتای بەیەك گەیشتن (المس) ونیکاح دێت.[5] هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی دەربارەی حۆریەکانی بەهەشت: ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴾ الرحمن: 56

3- پاك بوونەوە (القُرْءُ): خوێن دیتن و پاکی دوو ناوی دژ بەیەکن. ئەبو عوبەیدە دەڵێ: بۆ هەردوو ناو بەکاردێت (خوێن دیتن وپاك بوونەوە). هەروەها بەواتای کۆ بوونەوەی خوێن دێت لەمنداڵدان.[6] هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ البقرة: 228

1ـ للبخاري: 6- كتاب الحيض باب: كيف كان بدء الحيض، الرقم: 294، 529/1.
2 ـ ابن منظور، لسان العرب، 419/3.
3 ـ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري شرح صحيح البخاري، 518/1.
4 ـ الفراء: يحيى بن زياد الفراء أبو زكريا النحوي. لە كوفە لە دایك بووە، لە بەغدا دانیشتووە، پێشەوای ڕێزمان ونەحو بووە، لە ساڵی 207 کۆچی لە ڕێگەی مەککە وەفاتی کردووە.. العسقلاني، تهذيب التهذيب، 212/11.
5 ـ ابن منظور، لسان العرب، 198/8.
6 ـ المصدر نفسه، 80/11.

## بڕگەی سێیەم: گرنگی بێ نوێژی (أهمیة الحیض)

1- بێ نوێژی پەیوەستە بە زۆربەی عیبادەت و خواپەرستیەكانی وەك: نوێژ، ڕۆژو، تەواف، دەستدانە قورئان وخوێندنەوەی، مانەوە لە مزگەوت و پیا تێپەڕ بوون. ئەوانە هەموویان لە كاتی بێ نوێژیدا دروست نین.

2- بەهۆی بێ نوێژیەوە كاتی سك پڕی دەزانرێ، هەروەها ماوەی (عـدّة) ئافرەتی تەلاق دراو.

3- بە هۆیەوە كاتی پێگەیشتن وبلوغ دیاری دەكرێت، لە گەڵ جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی شەرعی دین ودونیا.

4- جووتبوون وبەیەك گەیشتن قەدەغەیە لە كاتی بێ نوێژی.

## بڕگەی چوارەم: كاتەكانی هاتن وبەسەرچوونی بێ نوێژی (إقبال الحیض وأدباره).

لە عائیشەوە[1] دەگێڕنەوە دەڵێ: فاتیمەی كچی ئەبی حەبیش[2] خوێنی دەبینی دوای بێ نوێژی، منیش پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: (( ئەو شلەیە خوێن نیە، هەر كات خوێنی بێ نوێژی بینی با نوێژەكان نەكات، ئەگەر كاتی بێ نوێژی بەسەر چوو، خۆی بشوات ونوێژەكان بكات)). ((ذلك عرق ولیست بالحیضة، فإذا أقبلت الحیضة فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغتسلي وصلي)).[3] لە ڕوایەتەكی تردا هاتووە: ((إذا كان دم الحیض فإنه أسود یعرف، فامسكي عن الصلاة...)).[4]

---

1 ـ عائشة بنت الصدیق: خێزانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە ڕودلوی ئیفك لە ئاسمانەوە بەرائەتی بۆ هاتە خوارەوە، جوبرائیل سەلامی بۆ دەنارد، لە ساڵی 58ك وەفاتی كردووە. ابن كثیر، البدایة والنهایة، 91/8. وكحالة، عمر رضا، إعلام النساء في عالمي للعرب والإسلام، 9/3.

2 ـ فاطمة بنت أبي حبیش: لەو ئافرەتانەیە كەوا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، سێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، عروەی كوڕی زوبێری كوڕی عەوام لێی وەرگرتووە. كحالة، أعلام النساء، 1142/3.

3 ـ البخاري: 6- كتاب الحیضباب: إقبال الحیض وأدباره الرقم:1،544/320.

4 ـ النسائي، سنن النسائي بشرح السیوطي وحاشیة الإمام السندي، 102/1.

هاتنی بێ نوێژی دەناسرێ بەو خوێنی کە لە کاتێکی دیاری کرلو دێتە خوارەوە، بەلآم کاتی کۆتایی هاتنی دیار نیە وناکۆکی لەسەرە لە نێوان زانایان، هەیانە دەڵێ: کۆتاییەکەی ووشك بوونی خوێنەکەیە، هەیانە دەڵێ: هەر کاتێ ئەو پارچە قوماشەی دانرابوو شلەیەکی ڕەنگ سپی پێوە نوسابوو لە جیاتی خوێن ئەوا واتای تەواو بوونی بێ نوێژیە.[1]

لە سەر ئەو فەرموودەیەی ئوم عەتیە دەیگێڕێتەوە ئەوا: خوێنی ڕەش ولێلێ (الصفرة و الكدرة)[2] لە ڕۆژانی بێ نوێژی ئەوە بە بێ نوێژ دەژمێردرێ، بەلآم لە دوای ئەو ڕۆژانە ئەوە پاکەو چی لەسەر نیە((كنا لا نعدّ الصفرة و الكدرة بعد الطهر شيئاً)).[3]

هەروەك ئیمامی شەوکانی دەڵێ: ڕەشی ولێڵی پاش ڕۆژانی بێ نوێژی، بە بێ نوێژی لە قەلەم نەداوە.[4]

سەرجەمی زانایان لەسەر ئەوەن پاش تەواو بوونی کاتی بێ نوێژی ئەوا پاککردنەوەو خۆشووشتنی لەسەرە.[5]

---

1 ــ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري شرح ، 544/1. ولسان العرب، 193/11.

القصة: پارچە قوماشێکی لۆکەیی سپی یە، ئافرەت بەکاری دەهێنێ بۆ داپۆشینی دەرە کۆئەندامی زاوزێ. البيضاء: ئاوێکی سپی یە کە لە مندالدانەوە دەردەچێت لە جیاتی خوێن(مەبەستی خانەو شانە مردووەکان ولینجە ماددەکانە).

2 ــ صفر: (الصُّفْرَةُ :ڕەشی ، ڕەش مەلکەڕلو ڕەش بوو. :﴿كَأَنَّهُ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾. صفْرة: الفراء، دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: ووشتری ڕەشە. الصفر سود الإبل لا يرى أسود من الإبل وهو مشرب الصفرة. لذلك سميت العرب السود صُفراً). ابن منظور، لسان العرب، 358/7. والكُدَرُ: (پێچەوانەی پاك وخاوێنە، لە الصحاح هاتووە: دژی ڕوون وپاکە. دەڵێن: ئاوێکی لێل وشێواوە. هەر ڕەنگێکیش بەرەو ڕەشی بڕوانێ. یان ژیانێکی تاڵ وڕەش. لسان العرب، 44/12.

3 ــ الشوكاني، نيل الأوطار شرح منتقى الأخبار، باب:الصفرة والكدرة ، 374/1.

4 ــ نيل الأوطار، الشوكاني، 337/1.

5 ــ عبد الكريم زيدان، المفصل في أحكام المرأة، 1/ 107.

## بڕگەی پێنجەم: ژمارەی ڕۆژەکانی بێ نوێژی (أقل الحيض وأكثره).

ماوەی بێ نوێژی جێگەی خیلافی زانایانە، بە گوێرەی ئەو فەرموودانەی هەن لە سەر ئەو بابەتە ماوەی دیاری کراوی بۆ نیە. لە زمان و لەشەرعیشەوە ماوەی دیاری کراوی نیە، بەڵکو هەر ئافرەتێك خۆی دەزانێ ماوەکەی بەرەچاو گرتنی ئەو خاڵانە: جۆری ژیان، نەتەوە، داب و نەریتی کۆمەڵگە، کەش و هەوای ئەو وولاتەی کە تیایدا دەژیت لە ڕووی گەرما و سەرماوە، کاریگەری ئەو بابەتانە لەسەر کرداری بێ نوێژی.[1]

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن: کەوا کەمترین ماوەی بێ نوێژی یەك شەو یەك ڕۆژە، درێژترین ماوەشی 15 ڕۆژە، زۆرینەی ئافرەتان 6-7 بێ نوێژ دەبن. خوێنی دوای 15 ڕۆژ بە خوێنی بێ نوێژی لە قەڵەم نادرێ.[2]

زۆربەی زانایانی هەر چوار مەزهەب لە سەر ئەوەن کەوا: کەمترین ماوەی پاك بوونەوە(الطهر) 15 ڕۆژە، زۆرینەکەشی ماوەی دیاری کراوی نیە.[3]

## بڕگەی شەشەم: حوکمەکانی بێ نوێژی (أحكام المرأة الحائض)

لەبەر بوونی ئەو هەموو نیشانانەی کە لە سەرەوە باسمان کرد، ئاینی ئیسلام زۆر ئەرك وفەرمانی لەسەر ئافرەتان لابردووە، یان کەم کردۆتەوە، وەك: چاوپۆشی کردن لە گێڕانەوەی نوێژەکان، دواخستنی ڕۆژوەکان بۆ کاتێکی تری گونجاو. فەرمانی بە هاوسەرەکەی کردووە کە نزیکی نەکەوێتەوە، چونکە ئازاری زیاد دەکات و زیانی تەندروستی هەیە بۆ هەردووکیان.

---

1 ـ عبد الكريم زيدان، المفصل في أحكام المرأة، 104/1- 105.

2 ـ ابن قدامة، المغني، 306/1. والشربيني، محمد الخطيب، مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، 108/1. والصاوي، أحمد بن محمد، بلغة السالك لأقرب المسالك إلى مذهب الإمام مالك، المعروف بحاشية الصاوي على الشرح الصغير للدردير، 78/1.

3 ـ الجزيري،عبد الرحمن،الفقه على المذاهب الأربعة،127/1.وسراج الوهاج،النووي،ص32.

ئیمامی ئیبنی تەیمیە لە کتێبی[1] (فقه النساء) دەڵێ: (لە کاتی بێ نوێژی و منداڵبووندا هەشت شت قەدەغە دەکرێت: نوێژ، ڕۆژو، خوێندنی قورئان، دەست لێدانی قورئان وهەڵگرتنی، تەوافی ماڵی خوا، چوونە ناو مزگەوت وبەناو تێپەڕ بوونی، بەیەك گەیشتن لەگەڵ هاوسەر، زەوق وەرنەگرتن بەو شوێنانەی دەکەوێتە نێوان چۆك وناوك. ئەگەر خوێنەکە وەستا، پێش خۆ شووشتن وپاککردنەوە هیچ یەکێك لەوانەی سەرەوە ناتوانێ ئەنجام بدات جگە لە ڕۆژو، تەلاق.[2]

**یەکەم: نوێژو ڕۆژو.**

ئافرەت کاتی بێ نوێژی، نوێژ ناکات ونوێژەکان ناگێڕێتەوە. لە ئەبی سەعیدی خودری[3] دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کەم وکورتی دینی ئافرەتان فەرموویەتی: ((کاتی بێ نوێژی نوێژ ناکات وڕۆژو ناگرێتەوە)).((ألیس إذا حاضت لم تصل ولم تصم)). هەروەها دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:(( نوێژەکان ناکات وناگێڕێتەوە)) ((تدعُ الصلاة)).[4]

موعاذة[5] دەگێڕێتەوە کەوا ئافرەتێك هاتە لای عائیشە ، ووتی: گەر پاك بووینەوە لە بێ نوێژی ئایا نوێژەکان بگێڕینەوە؟ فەرمووی: ئایا تۆ لە

---

1 ـ ابن تيمية: أحمد بن عبد الحليم الحراني. پێشەوا، زاناو دانا وفەقیە، دامەزرێنەری موجتەهید وموفەسیر، فتوای داوەو ولەوانەی گووتوتەوە. سەدەها کتێبی هەیە. لە سالی 728ك وەفاتی کردووە. ابن حجر، الدرر الكامنة، 154/1.

2 ـ ابن تيمية، أحمد بن عبد الحليم، فقه النساء، ص39. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، ص133، والنووي، سراج الوهاج، ص32.

3 ـ سعد بن مالك بن سنان الخدري: باوکی کە ناوی مالیك بوو لە شەڕی ئوحد شەهید بوو، لە خەندەق وپەیمانی حەیبیە بەشدار بووە. سالی 74ك وەفاتی کردووە. الذهبي،أعلام النبلا،172/3. والعسقلاني، ابن حجر، تهذيب التهذيب ، 417/3.

4 ـ البخاري:6- كتاب الحيض باب: ترك الحائض الصوم ، الرقم: 304 ، 526/1 و545/1.

5 ـ معاذة بنت عبد الله، أم الصهباء العدوية: لە عائیشەو ئیمامی عەلی فەرموودەی گێڕاوەتەوە. سالی 83 ك یان 101ك وەفاتی کردووە. كحالة ، عمر رضا ، أعلام النساء ، 60/5.

خەوارجەكانى؟ ئێمە لە كاتى بوونى پێغەمبەرى خواﷺ لە ناومان، نوێژەكانمان نەدەكردەوە.[1]

نوێژ ژمارەكانى زۆرەو هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبێتەوە، گێڕانەوەى قوورسە لە سەر ئافرەت، پێچەوانەى ڕۆژوە كە ساڵێ یەك جارە لەوانەیە تەنها چەند ڕۆژێك بگێڕێتەوە.[2]

ئیمامى شەوكانى دەڵێ: لە ئیمامى نەوەوى[3] وەرگیراوە كەوا سەرجەمى زانایان لەسەر ئەوەن كەوا لەسەر ئافرەت پێویست نیە گێڕانەوەى نوێژەكان، تەنها ڕۆووەكان دەگێڕێتەوە.[4]

نوێژ عیبادەتێكى جەستەیى ودڵ ودەروونیە، یەكێكە لە فەرزە هەرە گەورەكان، كۆڵەگەى ئیسلامە، پێویست ومەرجە یەكێك ئەنجامى بدات كە بە واتاى تەواوى پاكى پاك بێت[5]، تاوەكو بەدڵەكى پڕ ترس وخۆشەویستى وهەست وبیرێكى هۆشیار بوەستێ لە سەر پێ یەكانى بەرامبەر خواى گەورە بۆ ماوەیەك، بەلایەنى كەمەوە ڕۆژێ پێنج جار. هەروەها نوێژ هەندێ جولانەوەى تایبەتى وەك خۆ دانەواندن و كڕنۆش بردن وهەڵسانەوەى تیایە. ئەو مەرجانە هەموو پێویستن تاوەكو ئەدا كردنى نوێژەكە دروست بێت. ئەگەر تەماشاى ئافرەتێكى بێ نوێژ بكەین دەبینین

---

1 ـ البخاري: 6- كتاب الحيض باب: لا تقضي الحائض الصلاة، الرقم: 321 ، 546/1.

[2] ـ صحيح مسلم بشرح النووي، 26/4. وحاشية الصاوي، 81/1. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 133/1.

[3] ـ النووي: أبو زكريا يحي بن شرف الدين الدمشقي الشافعي. زانا، فقيهو زمانەوان، موحەدیس. لە شام لە دایك بووە لە ناوچەى (نوى) ساڵى 631ك، وانەى زۆربەى زانستەكانى وتووتەوە. ساڵى 677ك وەفاتى كردووە. كتێبى زۆرى داناوە. ابن كثير، البداية والنهاية ، 278/13.

[4] ـ الشوكاني، نيل الأوطار، 344/1.

[5] ـ پاكى یەكێكە لە مەرجەكانى نوێژ. پاكى دوو بەشە، پاكى حوكمى: پاك كردنەوەیە دواى حەدەسى بچوك(چوونە ئاو دەست ویا لێبەربوون) وحەدەسى گەورە (جووتبوون یان هاتنە خوارەوەى ئاوى پیاو یان ژن بەهەر هۆیەك بێت). پاكى ڕاستەقینە: بریتیە لە پاكى پۆشاك و جەستەو شوێنى نوێژ كردن. كامل موسى، أحكام العبادات، ص28. والفقه على المذاهب الأربعة، الجزيري، 1/1-4.

ئەو مەرجانەی تیا بەدی ناکرێت، بەهۆی نا ئاسایی باری جەستەیی ودەرونی، ناڵەباری و پشێوی هۆش وبیری، هاتنە خوارەوەی خوێنەکی نا سروشتی لە ڕەنگ وبۆن، بۆیە ئافرەت ناتوانێ ئەو ئەرکە گرنگە جێبەجێ بکات. هەر بۆیە خوای گەورە وبەزەیی مۆڵەتی ئافرەتی داوە کە ئەنجامی نەدات تاوەکو نەکەوێتە بارێکی ناهەموار بەرامبەر خولقێنەری، هەروەها بە بەرچاوی کەس وکاری تا پاك دەبێتەوەو باری تەندروستی دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی پێشوو، هەروەها ئەو نوێژانەی کە نەکراوە لەو ماوەیەدا نایگێڕێتەوە.

دەربارەی ڕۆژو: ئافرەتی بێ نوێژ تووشی چەند نیشانەیەکی نەخۆشی دەبێت لە کۆئەندامی هەرس(هەروەك باسمان کردن)، توانای بەرگری لەشی کەم دەبێتەوە بەرامبەر هێرشی میکرۆبەکان، چالاکی جەستەیی ودەرونیشی دادەبەزێ. هەر بۆیە خوای گەورە فەرمانی داوە بە ڕۆژو نەبێت تاوەکو پاك دەبێتەوەو تەندروستی ئاسایی دەبێتەوە.

دەربارەی گێڕانەوەی ڕۆژو: پێویستە ڕۆژوەکان بگێڕێتەوە تاوەکو خێرو چاکەی ئەو ڕۆژانە لە دەست نەدات کە تەنها ساڵێ یەك جار دێت ودەڕوات، بەڵام لە کاتێك بێت کە چالاکەو لە ڕووی جەستەیی و دەرونی ئامادەیە.

**دووەم: چوونە لای ئافرەتی بێ نوێژ (وطء الحائض).**

بە ڕای سەرجەمی زانایان، جووتبوونی هاوسەر لەگەڵ خێزانی لە کاتی بێ نوێژی جائیز نیە بە هیچ شێوەیەك، چونکە خواو پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە، ئەگەر هەریەکێك ئەو هەڵەیە بکات ئەوا کەفارەی لەسەرە. جووتبوون لەگەڵ ئافرەتی زەیستانیش هەمان حوکمی هەیە.[1]

بە بەڵگەی ئەو ئایەتە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ

---

1 ــ ابن قدامة، المغني، 335/1. والنووي في شرحه لصحيح مسلم، 204/3. والشوكاني، نيل الأوطار، 279/1. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة ، 133/1.

﴿يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة:222. مەبەستی لە (اعتزالهن): بە واتای جووت نەبوونە. بۆ نوێژی ئازارەو نزیکی مەکەون تاوەکو پاك نەبێتە، هەرکات پاك بوونەوە دەتوانن لێیان نزیك ببنەوە هەروەك خوا فەرمانی داوە، خوا تۆبەکاران وپاکەکانی خۆش دەوێت. لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە‌رضي الله عنه دەگێڕنەوە ، کە پێغەمبەری خوا‌ﷺ فەرموویەتی: (( دەتوانن لەگەڵ ئافرەتی بۆ نوێژ ڕابوێرن تەنها جووتبوون نەبێت)) ((اصنعوا كل شيء إلا النكاح)).[1]

لە مەیمونەوە‌رضي الله عنها دەگێڕنەوە[2]، کاتێ پێغەمبەری خوا‌ﷺ بیویستایە ڕابواردن بکات لەگەڵ یەکێك لە خێزانەکانی کاتی بۆ نوێژی، ئەوا فەرمانی بە داپۆشینی دامێنی دەکرد)).((إذا أراد أن يباشر امرأة من نسائه أمرها فاتزرت وهي حائض)).[3]

ئیمامی شەوکانی دەڵێ: ئەو فەرموودەیە واتای ئەوەیە کەوا هەموو لەشی ئافرەت حەلالە، تەنها زێ نەبێت، ئەویش دەبێت پارچە قوماشێکی لەسەر دابنرێ[4] هەروەها ئیبن تەیمیە دەڵێ: دەتوانێ ڕابواردن لەگەڵ هەموو لەشی بکات وبێ دانانی پارچە قوماش، تەنها جووتبوون حەڕامە.[5]

بۆ نوێژی ئازارە بۆ ئافرەت، نزیك بوونەوە لە ئافرەت ئەو ئازارە زیاد دەکات و دەبێتە هۆی گواستنەوەی میکرۆبەکان و هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ و منداڵدان و

---

1 ــ النيسابوري، مسلم بن الحجاج، صحيح مسلم. كتاب: الحيض: باب: مباشرة الحائض فوق الإزار الرقم:301 ، 246/1.

2 ــ ميمونة بنت الحارث بن حزن الهلالية: دایکی موسڵمانان، ساڵی شەشی کۆچی پێغەمبەری خوا‌ﷺ مارەی کردووە، دوایین خێزانی بووە، پووری عبد الله ی کوڕی عەباسە، فەرموودەی گێڕاوەتەوە، ساڵی 51ك کۆچی دوایی کردووە. المزي، أبو الحجاج، يوسف بن الزكي، تهذيب الكمال،312/35.وعبد السلام هارون، تهذيب سيرة ابن هشام، ص189،261. والخضري بك، محمد، نور اليقين، ص191.

3 ــ البخاري: 6- كتاب الحيض باب: مباشرة الحيض الرقم: 303 525/1.

4 ــ الشوكاني، نيل الأوطار، 341/1.

5 ــ ابن تيمية، فقه النساء، ص163.

هێلکەدان، لەوانەشە ببێتە هۆی گیرانی بۆڕی هێلکەدان. هەروەها ئەگەری زۆرە هەوکردنەکە بگوازرێتەوە بۆ کۆئەندامی نێرینە.

لەبەر ئەو هۆیانەیە ئاینی ئیسلام فێرمان دەکات چۆن مامەڵە بکەین لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ، تاوەکو دوور کەوینەوە لە زیانە ترسناکەکانی دواڕۆژ.

هەموو یەکێك دەتوانێ لەگەڵ خێزانی خۆی ئارەزووە جینسیەکانی تێر بکات لە کاتی بێ نوێژی، بەمەرجێ سنوور نەبەزێنێ. هەر بۆیە عایشە ﵂ فەرموویەتی: ((کێ لە ئێوە دەتوانێ خۆگربێ هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەگرت)).[1] هەر یەکێك متمانەی بە خۆی هەیە با ئارەزووەکانی تێر بکات، بەڵام خیلاف وجیاوازی لەسەر شوێنەکەیە، ئایا هەموو لەشیەتی یان لە نێوان ناوك وچۆکی قەدەغەیە، هەر وەك چۆن جووتبوون قەدەغەیە.

زانایان سێ جۆر ڕایان هەیە، یەکەمیان: دەڵێ حەرامەو بەڵگەشیان نیە، ئەویش بۆ ئەوەیە تاوەکو نەکەوێتە ناو حەرام وشوبهە. دووەمیان: مەکروهە کەراهیەتی تەنزیهی بەبەڵگەی ئەو فەرموودانە:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((دەتوانن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ ڕابوێرن تەنها جووتبوون نەبێت)). لە مەیمونەوە ﵂ دەگێڕنەوە، ((کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بیویستایە ڕابواردن بکات لەگەڵ یەکێك لە ئافرەتەکانی کاتی بێ نوێژی، ئەوا فەرمانی بە داپۆشینی دامێنی دەکرد)). سێیەم: مەرجی ئەوەی تیایە کە دەبێ متمانەی بە خۆی هەبێ، دووربکەوێتەوە لە جووتبوون، دوورکەوتنەوە لە نێوان چۆك وناووك. ئەو ڕایەی دوایی ئیمامی نەوەوی پەسەندی کردووە. هەروەها نووستن لەگەڵی جائزە لە ژێر یەك پێخەف. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی دەخەوت، سەری دەشووشت، سەری دەخاتە کۆشی عائیشەو قورئانی دەخوێند کاتی کەوتنە بێ نوێژی.

---

1 ـ البستي، محمد بن حبان التميمي، صحيح ابن حبان، الرقم: 3543، 313/8.

### سێیەم: تەڵاقدانی ئافرەتی بێ نوێژ

تەڵاقدان لە کاتی بێ نوێژی جێگەی خیلافی زانایانە، دەکەوێت یان نا. کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستی عبد الله ی کوڕی عومەری کوڕی خەتابی رضي الله عنه، خێزانی تەڵاقداوە لە کاتی بێ نوێژی بە[1] ئەویش فەرمووی: ((پێی بڵێ با بیگەڕێنێتەوەو لای بمێنێتەوە تاوەکو پاك دەبێتەوە، پاشان بکەوێتەوە بێ نوێژێ، پاشان پاك ببێتەوە، دوای دەتوانی لای خۆی بیهێڵێتەوە، یان تەڵاقی بدات بە مەرجێ نەچێتە لای لەو ماوەی کە لە پاکی دایە.((مره فليراجعها، ثم ليمسكها حتى تطهر، ثم تحيض، ثم تطهر، ثم إن شاء أمسك بعد وإن شاء طلق قبل أن يمس فتلك العدة التي أمر الله أن تطلق لها النساء)).[2] هەندێ لە زانایان دەڵێن: ((فليراجعها)) واتای ئەوەیە تەڵاقی کەوتووە، بەڵام دوای پاك بوونەو کەوتنە بێ نوێژی وپاك بوونەوەیەك کە نەچێتە لای، ئینجا تەڵاقی دەکەوێت. زانایان دەڵێن ئایا ئەو جۆرە تەڵاقدانە فەرمانی ئیستیحبابە یان فەرمانی واجیبە؟ ئیستیحباب مەزهەبی ئیمامی حەنیفەو شافیعیە، واجیبیش لە مەزهەبی ئیمامی مالیکە. هەروەها خیلاف هەیە لە سەر ئەوەی کە تەڵاق دەکەوێت لە دوای بێ نوێژی یەکەم یان دووەم. لێرەوە کۆتایی دەهێنین بەو باسە. بۆ زیاتر زانیاری دەتوانن لە کتابەکانی فیقهی سوود وەربگرن و لە وردەکاریەکانی بکۆڵنەوە.

ئەوەی گرنگە لێرەوە باسی بکەین ئەوەیە ئایا هۆکارو عیلەتی نەکەوتنی تەڵاق چی یە کاتی بێ نوێژی؟ ئایا لەبەر ئەوەیە عیدەکەی درێژ دەکاتەوە، هەروەك لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی ومالیکی و زۆربەی هاوەڵانی ئیمام ئەحمەد دا هاتووە؟ یان لەبەر ئەوەیە، چونکە ناتوانێ بچێتە لای، تەڵاقیش ناکەوێت تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ئارەزوو توانای چوونە لای ئافرەتی هەبێ، هەروەك ئیمامی ئەبو حەنیفەو

---

1 ــ عمر بن الخطاب بن نوفل القرشي :پێش کۆچ کردن بە پێنج ساڵ موسڵمان بووە، دووەم خەلیفەی ڕاشیدینە، یەکێکە لەو دە کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، خەلافەتی وەرگرت لە ساڵی 13ك، شام و عێراقی فەتح کرد، دیوانی دانا، نیشانەی ڕاستی وپاکی و سیاسەت وحیکمەت بوو، شەهید بوو بە دەستی مەجوسیەك لە ساڵی 24ك. الإصابة، الرقم:4834، 511/2.

2 ــ البخاري:68- كتاب الطلاق باب: مراجعة الحائض الرقم:5251 ، 429/9. ومسند إمام أحمد، 4789/2.

هەندێ لە هاوەڵانی ئەحمەد ڕایان وایە. یان ئەو بابەتە شتێکی تەعەبودیەو واتای ڕوونی نیە، هەروەك هەندێ لە مالیکیەکان دەڵێن؟ [1]

لێرەوە دەمەوێت هەندێ خاڵ ڕوون بکەمەوە دەربارەی هۆکاری نەکەوتنی تەڵاق کاتی بێ نوێژی.

أ- ڕێزگرتن و چاودێری کردنی ئەو بارە دەرونیە نالەبارەی، کە ئافرەت تیایدا دەژیت لە لاسەنگی میزاج، دابەزینی هاوسەنگی کردارەکانی لەش، زیاد بوونی هەڵچوون ودەمارگیری.

ب- ڕێزگرتن و چاودێری کردنی ئەو بارە تەندروستیە نالەبارەی کە ئافرەت تیایدا دەژیت، هەروەك نەخۆشێك دێتە بەرچاو، بە هۆی ئەو گۆڕانکاریە زۆرەی بەدی دەکرێت لە ڕێژەی هۆرمونەکان وکاریگەری فسیۆلۆژی وبایۆلۆژیەکانیان.

ئەو دوو خاڵە کاریگەریەکی زۆریان هەیە لە سەر کردەوەو هەڵوێستی ئافرەت، لەوانەیە هەندێ هەڵویست وکردەوەی خۆ نەویست بکات، خۆی لەو کردەوانە ڕازی نیە لە کاتی پاك بوونەوەی پەشیمانە لێیان. ئاینی ئیسلام ئەو گۆڕانکاریانە لەبەرچاو دەگرێت و ڕێزی دەگرێت. بۆیە ئاگاداری پیاوەکان دەکاتەوە، کە لەو کاتانەدا ئافرەت تەڵاق نەدەن، چونکە ئەو کردەوە ناشیاوانەی کردوویەتی کاتی یە، بە ویستی خۆی نەیکردووە.

ج- کەم بوونەوەی ئارەزووی جینسی ئافرەت لەو ماوەیەدا بەهۆی دابەزینی کتوپڕی هۆرمونەکانی جینسی، وا دەکات ئافرەت نەتوانێ سۆزو خۆشەویستی پیاو بۆ خۆی ڕاکێشێ. هەروەك ئاشکرایە ئارەزووی جینسی یەکێکە لە چەك و سیلاحەکانی ئافرەت بۆ کێش کردنی دڵی پیاو بۆ لای خۆی ولابردنی خەم و پەژارەی وتوڕەبوون وماندوو بوونی، کە هەر ئەوانەن هۆکاری تەڵاقدان. لە کاتی بێ نوێژی ئەو چەکە ڕۆڵی نامێنێ بۆیە تەڵاقدان دێتە پێشەوە. گەر ئەو ماوەیە تەواو بوو ئەوا نزیك بوونەوەو خۆشەویستی دروست دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە

---

1 ـــ ابن تيمية، فقه النساء، ص271-272.

پاك بۆوەو پیاوەکە نەچۆوە لای ئافرەتەکەو ئارەزووی تەلاقدانی هەبوو ئەوا واتای ئەوەیە تەلاقدانەکە لە ژێر کاریگەری ئەو ماوەیە نا ئاسایی یی نەبووە، بەڵکو هۆکاری تر هەیەو لێك جیا دەکرێنەوە.

د- ئافرەت لە کاتی بێ نوێژیدا زیاتر لە هەموو کات پێویستی بە سۆزو عەتف، مامەڵەی نەرم، ڕێز گرتن، دڵ نەڕەنجاندن هەیە، چونکە باری دەرونی لاسەنگەو چاودێری پێویستە، نەوەك لە جیاتی ئەوە دەرون و هەستی بریندار بکەیت و نەفسیەتی وورد وخاش بکەیت بە ووشەی تەلاق. ئەوانەش پێچەوانەی بەزەیی و سۆزو خۆشەویست و ڕێزگرتنە کە لە ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلامە.

وەك بەزەیی وسۆزو ڕێز گرتنێك ئاینی ئیسلام قەدەغەی تەلاقی کردووە، چونکە لەوانەیە ئەو تەلاقدانە لاسەنگی دەرونیەکەی زیاد بکات ببێتە هۆکارێك بۆ پشێوی عەصەبی توندو قووڵ ولەدەسدانی کۆنترۆلی عەصەبی، ئەنجامدا هەندێ کاری نا دروست بێتەکایەوە، وەك: تێکچوونی دەماری ودەرونی، شێت بوون، خۆ کوشتن... هتد.

لێرەوە چاودێری و ڕێز گرتنی ئیسلاممان بۆ دەردەکەوێت بەرامبەر بە ئافرەت، باتایبەتی لەکاتە نا ئاساییەکاندا. پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی بەو بابەتە داوە، ئەو دیاردە چەوت ولارانەی کە جوولەکەکان هەیان بووە بەرامبەر ئافرەتی بێ نوێژ ڕاستی کردۆتەوە، هەروەك فەرموویەتی: ((یەهودیەکان کاتێ ئافرەت بێ نوێژ دەبوو لە ماڵ دەریان دەکرد، نانیان لەگەڵ نەدەخوارد ونە دەچوون بەلایان بۆ تێرکردنی ئارەزووی جینسی)) ((إن اليهود كانت إذا حاضت منهم المرأة أخرجوها من البيت ولم يؤاكلوها ولم يجامعوها)).[1] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((دەتوانن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ ڕابوێرن تەنها جووتبوون نەبێت)). هەر بەوەندە نەوەستاوە، بەڵکو فێری موسڵمانای کردووە کەوا چۆن مامەلە لە گەڵ ئافرەتەکانیان بکەن کاتی بێ نوێژی، وەك بەیەکەوە نان خواردن، بەیەکەوە

1 ـ مسلم: كتاب: الحيض باب: جواز غسل الحائض رأس زوجها ،الرقم: 302،246/1.

خەوتن، تێرکردنی ئارەزووەکان بەهەموو جۆرەکانی شەرعی تەنها جووتبوون نەبێت، کە زیانی سەرەکی وگەورەی بۆ ئافرەتەکەیە. ئەوەیە فەرمان ورێنماییەکانی ئاینی ئیسلام چۆن ڕەچاوی باری تەندروستی وکات وشوێن دەکات، چۆن ئافرەت بەرز دەکاتەوەو ڕێز لە کرداره فسیۆلۆژیەکانی دەگرێت؟ چۆن دەرونی ئاسوودە دەکات وخەم وئازارەکانی جەستەیی و دەرونی دەڕەوێنێتەوە بەو مامەڵە شیرین و جوانانە.

ئا ئەوەیە ئاینی فیترەت وخۆڕسك، کە غەریزە کپ ناکات ولەناوی ببات، جلەوی بۆشل ناکات وهیلاکی بکات، ناوەندەڕێگەی گرتووەوئاڕاستەی ڕاست ودروستی دەکات بەبێ زیادو کەمی(لا تفريط و لا إفــراط)، ڕێگەش نادات بەولاو بەولادالار بێتەوە.

**چوارەم: خوێندنەوەی قورئان و مانەوە لە مزگەوت (قراءة القرآن والمكث في المسجد).**

لە ئیبن عومەرەوە‌ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا‌ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوانەی جەنابەت بوونە، ئەوانەی بێ نوێژن، نابێ قورئان بخوێننەوە)): ((لا يقرأ الجنب والحائض شيئاً من القرآن)).[1]

لە عائیشەوە‌ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا‌ﷺ فەرموویەتی: ((مزگەوت بۆ ئەوانەی جەنابەت بوونە، هەروەها ئەوانەی بێ نوێژن حەلال نیە)) (( لا أحلُّ المسجد لحائض ولا جنب)).[2]

سەرجەمی زانایان لەگەڵ ئەوەدان کەوا ئەوانەی جەنابەت بوونە، ئەوانەی بێ نوێژن، نابێ قورئان بخوێننەوەو بچنە مزگەوتەکان.[3]

---

1 ــ القزويني، أبو عبد الله، محمد بن يزيد ، سنن ابن ماجه، 595/1. والجرجاني، أبو أحمد عبد الله بن عدي، الكامل في ضعفاء الرجال، 289/1.

2 ــ البيهقي، أبو بكر، أحمد بن الحسين، سنن البيهقي الكبرى، باب: الجنب يمر بالمسجد ولا يقيم فيه، 442/2. ولأبي داود، كتاب الحيض، باب:في الجنب يدخل المسجد، الرقم: 232، 60/1.

3 ــ ابن رشد الحفيد القرطبي، محمد بن أحمد الأندلسي، بداية المجتهد ونهاية المقتصد، 38/1. والشربيني، مغني المحتاج، 72/1. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 133/1.

تەنها مەزهەبی ئیبن حەزمی الظاهري بۆ هەردووکیانی ڕەوا کردووە، چوونە مزگەوت وخوێندنەوەی قورئان.[1]

شیخ عبد العزیز بن الباز دەڵێ: بۆیان ڕەوایە قورئان بخوێننەوە چونکە هیچ بەڵگەیەکی تەواوی قەتعی لە دەست نیە کە بێ نوێژ قورئان نەخوێنێ، ئەو قەدەغەیە بۆ ئەوانەیە کە جەنابەت بوونە. ئەو فەرموودەی ئیبن عومەریش کە دەربارەی ئەو دوو چینە هاتووە لاوازە. ئافرەتی بێ نوێژ بۆی هەیە قورئان لەبەر بخوێنێ، جیاوازیش لە نێوان بێ نوێژو زەیستان وجەنابەت ئەوەیە: جەنابەت کاتەکەی کورتە، بە دەست خۆیەتی دەتوانێ بەزووترین کات خۆی بشوات وپاك بێتەوە، ئەگەر ئاویش نەبوو ئەوا دەتوانێ تەیەمم بکات ونوێژەکانی بکات وقورئان بخوێنێ. بەڵام بێ نوێژو زەیستان بە ویستی خۆیان نیە، بەڵکو ناچارن چاوەڕوان بن تاوەکو پاك دەبنەوە، ئەوەش لەوانەیە کاتەکی زۆری بووێت کەدەگاتە چەند ڕۆژێك یان زیاتر. هەر بۆیە ڕەوایە بۆیان قورئان بخوێنن تاوەکو لە بیریان نەچێت ولەو خێرە گەورەیەش بێ بەش نەبن.[2]

بەنیسبەت مانەوە لە مزگەوت: لە ئوم سەلەمەوە[3] دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ چووە ناو مزگەوت و بەدەنگێکی بەرز فەرمووی: ((مزگەوت بۆ ئەوانەی جەنابەت بوونە، هەروەها ئەوانەی بێ نوێژن حەڵاڵ نیە)) ((أن المسجد لا یحل لحائض ولا جنب)).[4]

---

1 ـ الظاهري، علي بن أحمد، المحلى بالآثار، تحقيق، 77/1. ابن حزم:علي بن أحمد الظاهري الأندلسي: ئەدیب و فەقیە، لە قورتوبە لە دایك بووە سالی 384ك. خاوەنی مەزهەبی زاهیریە، نوسراوو کتێبی زۆرە. سالی 456ك کۆچی دوایی کردووە. ابن عماد الحنبلي، أبي فلاح، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، 299/3.

2 ـ بن باز،عبد العزيز بن عبد الله، فتاوى المرأة، ص44-45.

3 ـ أم سلمة:هند بنت أبي أمية المخزومية:28 سال پێش کۆچ کردن لە دایك بووە، سالی چوارەمی کۆچی پێغەمبەری خواﷺ هێناویەتی، خاوەنی عەقل وڕەوشتەکی بەرز بوو، لە کۆچ کردووەکانی سەرەتایی بوو، هەندێ لە منداڵەکانی هاوەڵی پێغەمبەر بوون. سالی 68ك کۆچی دوایی کردووە. ابن حجر، الإصابة، 458/4، الرقم:1309.

والذهبي، سير أعلام النبلاء، 201/2. والأعلام، الزركلي، 97/8.

4 ـ الجعفي، محمد بن إسماعيل، تاريخ الكبير، 183/6. والمزي، أبو الحجاج، تهذيب الكمال، 271/27.

ئیمامی شەوکانی[1] دەڵێ: ئەوانەی جەنابەت بوونە لە مزگەوت نامێننەوە، ڕووداوی بێ نوێژی گەورەترە لە جەنابەت بوون، بۆیە لە لای زانایانی بێ نوێژی لەپێشترە (أولی) بە قەدەغە کردن.[2]

**پێنجەم: دەست لێدانی قورئان وهەڵگرتنی (مس المصحف وحمله)**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴾ الواقعة: 79.لە ئیبن عومەرەوەﷺ دەگێڕنەوەکە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((نابێ کەس دەست لە قورئان بدات تەنها ئەوەی پاك نەبێت)). ((أن لا يمسّ القرآن إلا الطاهر)).[3]

بەڕای سەرجەمی زانایان بێ نوێژی نابێ دەست لە قورئان بدات.[4] ئیبن حەزمی الظاهري دەڵێ: ڕەوایە ئەوانەی لە جەنابەتن دەست لە قورئان بدەن.[5] هەروەها ئەو گەنجەی پێگەیشتووە وجەنابەت بووە دەست لە قورئان بدات بە مەبەستی فێربوون، تاوەکو ئەو ماندوو بوونەی لەسەر هەڵسێ بەوەی کە بەردەوام پاك بێت.[6]

**شەشەم: تەوافی بەیت (الطواف)**

لە ئیبن عەباسەوە[7]ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((تەوافی ماڵی خوا وەکو نوێژ وایە، تەنها جیاوازی ئەوەی هەیە دەتوانن قسە

---

1 ــ الشوكاني الصنعاني: فەرموودەی هەیە، تەفسیری قورئانی هەیە، فەقیهە، لە ساڵی 1173ك لە دایك بووە، کتێبی زۆری داناوە، ساڵی 1250 ك لە سەنعا کۆچی دوایی کردووە. الشوكاني، البدر الطالع والملحق التابع لمحمد بن يحي ، 214/2.

2 ــ الشوكاني، نيل الأوطار، 390/1.

3 ــ مالك بن أنس الأصبحي،الموطأ،كتاب:القرآن باب:الأمر بالوضوء لمن مس القرآن ،199/1.

4 ــ الجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 133/1.

5 ــ ابن حزم الظاهري، المحلى، 77/1.

6 ــ ابن قدامة، المغني، 301/1.

7 ــ عبد الله بن عباس بن عبد المطلب: زانای ئوممەتی موحەمەدو ڕاڤەکەری قورئانە، زۆر فەرموودەی لە پێغەمبەری خواﷺ گێڕاوەتەوە، لە زۆربەی هاوەڵەکان زاناتر بووە، لە تەفسیرو ڕاڤە کردن زۆر بلیمەت بووە. ساڵی 68 ك کۆچی دوایی کردووە. الذهبي، أعلام النبلاء، 331/3.

بكەن، ئەوەی قسەش دەكات با تەنها خێر بڵێت)).((إن الطـواف بالبيـت مثـل الصلاة،إلا أنكم تتكلمون، فمن تكلم فلا يتكلم إلا بخير)).[1]

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە عائیشەی ﵂ فەرموو كاتێ بێ نوێژی بوو لە كاتی حەجدا: ((ئیارە تووشی بێ نوێژی بووی، ئەوە شتێكە خوای گەورە لەسەر كچەكانی ئادەمی نوسیووە، هەروەك حاجیەكانی تر بكە، تەنها ئەوە نەبێ تەوافی ماڵی خوا مەكە)). ((...قال لعلكِ نُفِسْتِ ؟ قالت: بلى. قال: هذا شيء كتبه الله على بنات آدم، فافعلي ما يفعل الحاج، غير أن لا تطوفي بالبيت حتى تطهري)). [2]

ئافرەتی بێ نوێژ تەوافی ماڵی خوا ناكات، هەموو زانایان لەسەر ئەو رایەن، لەگەڵ جیازای لە هۆیەكەی، دەڵێن: لەبەر ئەوەیە پاكی یەكێكە لە مەرجەكانی تەواف، یان لەبەر ئەوە چوونە مزگەوت بۆیان رەوا نیە بۆیە تەوافیش بۆیان رەوا نیە.[3]

---

1 ـ النيسابوري، ابن خزيمة، أبو بكر محمد بن إسحاق السلمي ، صـحيح ابـن خزيمـة، 222/4.

2 ـ البخاري: 6- كتاب الحيض باب: كيف كان بدء الحيض الرقم:529/2941.

3 ـ ابن قدامة، المغني ، 307/1.

# باسی دووەم

# خوێنداری- خوێن بینین

(الاستحاضة- نزف العسر الوظيفي للرحم" Dysfunction Uterine Bleeding)
DUB-

بەندی یەکەم: واتاو جۆرەکانی خوێنداری

بڕگەی یەکەم: واتای خوێنداری

بڕگەی دووەم: جۆرەکانی خوێنداری

بەندی دووەم: هۆیەکانی خوێنداری

بڕگەی یەکەم: هۆیەکانی نا ئورگانی

بڕگەی دووەم: هۆیەکانی ئورگانی

بەندی سێیەم: حوکمەکانی خوێنداری

بڕگەی یەکەم: واتای خوێنداری

بڕگەی دووەم: گرنگی خوێنداری

بڕگەی سێیەم: جیاوازی نێوان بێ نوێژی وخوێنداری

بڕگەی چوارەم: جیاوازی لە نێوان حوکمەکانی ئافرەتی بێ نوێژی و خوێنداری

بڕگەی پێنجەم: ڕای دانەر لەسەر نزیک بوونەوە لە ئافرەتی خوێندار.

باسی دووەم: خوێنداری

## بەندی یەکەم: واتاو جۆرەکانی خوێنداری

### بڕگەی یەکەم: واتای خوێنداری

خوێن بەربوونێکە لە منداڵداندا ڕوو دەدات بە هۆیەك لە هۆیەکانی پەیوەست بەو شوێنە- شوێنەواری(الموضـــــعی)، وەك: شێرپەنجەی کۆئەندامی زاوزێ یان هەوکردنیان، کاریگەرە لابەلاکانی سك پڕی، بەهۆی لاسەنگی هۆرمونەکان.[1]

### بڕگەی دووەم: جۆرەکانی خوێنداری (أنواع الاستحاضة)

زۆر جۆر خوێنداری هەیە، لەوانە:[2]

1- زیـــاد بـــوونی ڕۆژەکـــانی بـــێ نوێـــژی (- Excessive duration (Hypermenorrhea

2- زیاد بوونی بڕی خوێنەکە( Excessive amount–Menorrhagia )

3- بڕی خوێنە زۆرە زۆرە( Too frequent – Polymenorrhea)

4- خوێن بەربوونەکە پچڕ پچڕە(Inter menstrually- Metrorrhagia)

## بەندی دووەم: هۆیەکانی خوێنداری

دوو هۆکاری سەرەکی هەیە بۆ خوێنداری.[3]

---

*1– Stanley G.Clayton et al.. Gyaecology by ten teaches. P: 240.*

*2– Stuart.Combell&Ash.Manga. Gyaecology by ten teaches. P: 48.*
*- Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 812.*

*3– Stuart.Combell&Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 49.*
*-Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 813.*
*- Kurt.J.Isselbacher& Others. Harisons Principle of internal medicine. P: 1785.*
*- Leon Sperof.K. Clinical Gynecologin Endocrinology&Infertility. P: 265.*

## بڕگەی یەکەم: هۆیەکانی نا ئەندامی (نا ئۆرگانی)

بریتیە لە سەرنەکەوتنی کرداری هێلکەدانان لە ئەنجامی گۆڕانی کاری تەوەرەی (دەمار- هۆرمونی)، کە دەگاتە نزیکەی 85% کۆی هەموو هۆیەکان، ئەویش دەکرێتە دوو بەش:

أ- هۆیەکانی پەیوەست نیە بە کرداری هێلکەدانان. ڕوو دەدات لەو ئافرەتانەی گەیشتوونەتە دوا تەمەنی زاوزێ، بەتایبەتی لەوانەی قەڵەون. ئەو جۆرە بەوە دەناسرێتەوە کە خوێن بەربوونەکی ناڕێکە.

ب- هۆیەکانی پەیوەست بە هێلکە دانان. ڕوو دەدات لەو ئافرەتانەی گەیشتوونەتە 35-45 ساڵ. ئەو جۆرە بەوە دەناسرێتەوە کە خوێن بەربوونەکی ڕێك وزۆرو بە ئازارە.

## بڕگەی دووەم: هۆیەکانی ئەندامی(ئۆرگانی)

أ- هۆیەکانی شوێنەواری (الموضـــعي): شێرپەنجەی کۆئەندامی زاوزێ یان هەوکردنی ئەو کۆئەندامانە، شێرپەنجەی کوشندە، شێرپەنجەی لیمفە گلاندەکان، ئەو شێرپەنجانەی کە هۆرمونی جینسی دەردەدەن، زامدار بوونی کۆئەندامی زاوزێ بەتایبەتی زێ و ملی منداڵدان، شێواوی بۆڕیەکانی خوێن، بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕێگرتن لە سك پڕی (منع الحمل).

ب- هۆیەکانی گشتی جەستەیی

* پشێوی لە کاری ڕژێنەگلاندەکان: ڕژێنەگلاندی ژێر مێشك، گلاندی دەرەقی، گلاندی سەر گورچیلە، پشێوی لە بڕی هۆرمونی پرۆلاکتین.

* نەخۆشیەکان: نەخۆشی شەکرە، نەخۆشیەکانی خوێن، جگەر، گورچیلە.

* زیانی دەرمان: دەرمانەکانی کە ماددەی ستیرۆیدیان تیایە، دەرمانەکانی چارەسەری شێرپەنجە.

* كێشەی سك پڕی: سك پڕی لە دەرەوەی منداڵدان، سك پڕی هێشوویی، لە بارچوون– جۆری هەڕەشەیی، ناتەولو، تەواو، ژەهراوی.
* هۆكاری دەرونی: كێشەكانی دەرونی وەك: لاسەنگی، پشێوی، هەڵچوون.

## بەندی سێیەم: حوكمەكانی خوێنداری

## بڕگەی یەكەم: واتای خوێنداری

بریتیە لە خوێن هاتنی بەردەوام دوای تێپەڕ بوونی ڕۆژەكانی بێ نوێژی (ژمارەی ڕۆژەكانی بێ نوێژی ئافرەت خۆی دەیزانێ بەهۆی شارەزایی بەردەوامی خۆی).

واتە: ئەگەر خوێن هاتە خوارەوە لەو كاتانەی كە ئافرەت خۆی دیاری كردبوو ئەوا بێ نوێژیە، ئەگەر لە كاتەكانی تردا بوو ئەوا خوێنداریە– خوێن داری یە (ئیستحازەیە).[1]

خوێنداری لە ڕووی زاراوەییەوە: بریتیە لە هاتنە خوارەوەی خوێن لە كاتی نا ئاسایی– واتە كاتی بێ نوێژی وزەیستانی نەبێ– وەك خوێن بینین دوای تێپەڕ بوونی ماوەی دیاری كراوی بێ نوێژی، خوێن بینینی كەمتر لە ژمارەی ڕۆژەكانی بێ نوێژی، یان پێش تەمەنی كەوتنە بێ نوێژی(منداڵی).[2]

ئیبن حەجەر لە كتێبی[3](فتح الباري)دا دەڵێ: زوهری[4] دەڵێ: خوێنی بێ نوێژی

---

1 ـ ابن منظور، لسان العرب، 419/3.

2 ـ الجزيري الفقه على المذاهب الأربعة، 129/1. والبغا، التهذيب، متن أبي شجاع، ص37.

3 ـ ابن حجر: أبو الفضل أحمد بن علي الكناني العسقلاني. لە میسر ژیاوە، موحەدیس ومێژوو نووس وئەدیب وشاعیر. كتێبی زۆری داناوە، لە ساڵی 852 ك كۆچی دوایی كردووە. ابن عماد الحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، 270/7.

4 ـ الزهري:محمد بن مسلم بن عبد الله بن شهاب: لە ساڵی 58ك لە دایك بووە، یەكەم كەس بووە كە فەرموودەی نوسیووەتەوە. تابیعیەو خەڵكی شاری مەدینەیە. یەكێكە لە گەورە پیاوانی حەدیس و فەقیهە، لە شام دانیشت ولەوێ ماوە. ساڵی 124ك لە شام كۆچی دوایی كرد. الزركلي، الأعلام، 97/7.

لە بنکەی منداڵدانەوە دێت وگەرمەو ڕەشە، بەڵام خوێنی خوێنداری زۆربەی لە ملی منداڵدانەوە دێت وڕەنگی وەك خوێنی بێ نوێژی نیە.[1]

## بڕگەی دووەم: گرنگی خوێنداری (أهمية الاستحاضة).

ئیسلام گرنگیەکی زۆری داوە بە بابەتی جیاوازی لە نێوان خوێنی بێ نوێژی و خوێنداری، چونکە هەر یەکیان حوکمی تایبەتی خۆی هەیە. ئافرەتی بێ نوێژ، نوێژ ناکات، ڕۆژو ناگرێ، تەواف ناکات، قورئان دەست لێ نادات وناچێتە مزگەوت بۆ مانەوە، هاوسەری ناچێتە لای، بەڵام ئافرەت لەکاتی ئستیحازە هەموو ئەو عیبادەتانە ئەنجام دەدات تەنها خیلاف هەیە لەسەر نزیك بوونەوەی لە هاوسەری بۆجووتبوون.

لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێ: فاتیمەی کچی ئەبی حەبیش خوێنی دەبینی دوای بێ نوێژی، منیش پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش فەرمووی: ((خوێنی بێ نوێژی ڕەشە و ناسراوە، هەر کات خوێنی بێ نوێژی بینی با نوێژەکان نەکات، ئەگەر کاتی بێ نوێژی بەسەر چوو، خۆی بشوات و نوێژەکان بکات)). ((ذلك عرق وليست بالحيضة، فإذا أقبلت الحيضة فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغتسلي وصلي)).[2] لە ڕوایەتەکی تردا هاتووە: ((إذا كان دم الحيض فإنه أسود يعرف، فامسكي عن الصلاة)).[3] پێویستە دەست نوێژ بشوات بۆ هەموو نوێژەکان، لەگەڵ نوێ کردنەوەی داپۆشەری دامێن.[4]

---

1 ـ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري شرح البخاري ، 530/1.

2 ـ البخاري: 6- كتاب الحيضباب: إقبال الحيض وأدباره الرقم:320 ،544/1.

3 ـ البخاري: 6- كتاب الاستحاضة باب: الاستحاضة ، الرقم: 306 ، 530/1. و الطبراني، أبو القاسم، المعجم الكبير، 309/24. النسائي، سنن النسائي بشرح السيوطي وحاشية الإمام السندي، 102/1.

4 ـ مغني المحتاج، للشربيني، 111/1. والنووي ، سراج الوهاج، ص33.

## بڕگەی سێیەم: جیاوازی نێوان بێ نوێژی وخوێنداری

1- خوێنی بێ نوێژی ڕەشە، خوێنی خوێندار زۆربەی ڕەنگی سوورە.

2- خوێنی بێ نوێژی بۆنێکی تایبەتی هەیە، خوێنداری بۆنی تایبەتی نیە.

3- خوێنی بێ نوێژی نا بێ کەمتر بێ لە شەو ڕۆژێك وزیاتر بێت لە 8 ڕۆژ، گەر لەو ماوەیە کەمتر بوو یان زیاتر ئەوە زۆربەی بە خوێنداری دادەنرێ. بەڵام لە شەرعەوە کەمترینی یەك شەو ڕۆژەو زۆرینەی 15 ڕۆژ، لەو ماوەیە کەمتر یان زیاتر ئەوە زۆربەی بە خوێنداری دادەنرێ. ئەوە ڕای شافیعی وحەنبەلی ومالیکیەکانە.[1]

4- هاتنە خوارەوەی خوێنی بێ نوێژی بە تەوژمە، خوێنداری لەسەر خۆ دێتە دەرەوە.

5- کەمترین تەمەنی بێ نوێژی9 ساڵە. هەر خوێنەك پێش نۆ ساڵ هاتە خوارەوە ئەوە خوێنداریە، هەروەها ئەو خوێنەی کاتی سك پڕی دێتە خوارەوە ئەوە خوێنداریە.

6- خوێنی بێ نوێژی پاش تەمەنی45- 55 ساڵ نامێنێ لە زۆربەی ئافرەتان، هەر خوێنەك دوای ئەو تەمەنە هاتە خوارەوە ئەوە خوێنداریە.

## بڕگەی چوارەم: جیاوازی لە نێوان حوکمەکانی ئافرەتی بێ نوێژی و خوێندار

أ- ئافرەتی بێ نوێژ ڕەوا نیە تەواف بکات، قورئان بخوێنێتەوە، لە مزگەوت بمێنێتەوە، بەڵام لە کاتی خوێنداری هەموو ئەوانە دەتوانێ بکات.

ب- ئافرەتی بێ نوێژ نوێژ ناکات، بەڵام لە کاتی خوێنداری دەتوانێ نوێژ بکات، بەڵام بۆ هەر نوێژەك دەست نوێژ دەشواتەوە، هەروەك هاتووە لە حەدیسی فاتیمەی کچی حبیش ﷺ: ((توضئي لكل صلاة)).[2]

ج- بێ نوێژ ڕۆژو ناگرێ، بەڵام خوێنداری حوکمی نەخۆشی هەیە.

---

1 ــ الجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 129/1. والنووي، سراج الوهاج، ص13 .
2 ــ الشوكاني، نيل الأوطار ، 286/1.

1- بە ڕۆژو دەبێت ئەگەر هۆیەکەی شوێنەواری بێت، یان بە هۆی نەخۆشیەکی کشتی بێت.

2- ئەگەر نەخۆشیەکەی قورس بوو، وەك: شێرپەنجەی خوێن، ژەهراوی بوونی خوێن، ڕۆژو لەسەری گران بوو، ڕۆژوەکە ناگرێت، لەجیاتی هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات.[1] خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ البقرة: 184.

3- ئەگەر نەخۆشیەکەی سووك بوو، چاوەڕوانی شیفای لێ دەکرا، یان ئەگەر ڕۆژوەکە بووە هۆی قورس کردنی نەخۆشیەکەی، یان بووە هۆی دواکەوتنی چاك بوونەوەی، یان بووە هۆی کەم کردنەوەی کاریگەری دەرمانەکانی ئەوا بۆی هەیە ڕۆژوەکە نەگرێ ودوایی بیان گرێتەوە.[2] ئەو حالەتەی باسمان کرد ئەو نەخۆشیانە دەگرێتەوە: نەخۆشیەکانی ڕژێنە گلاندەکان، هەوکردنی ئەندامەکان، دەرمانی کیمیاوی بۆ چارەسەری شێرپەنجە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾البقرة: 185.

ئیبن حەزم دەڵێ: قەزاو گێڕانەوەی ڕۆژو نیە لە پێنج باردا نەبێت: بێ نوێژ، زەیستان، نەخۆش، چوونە سەفەری دوور، ئەوەی خۆی دەڕشێنێتەوە بە ویستی خۆی.[3]

د- چوونە لای ئافرەتی: لە کاتی بێ نوێژی قەدەغەیە، بەڵام بۆ خوێنداری جیاوازی هەیە: حەمنەی کچی جەحش ﷺ[4]: ((خوێندار دەبوو، بەڵام مێردەکەی

[1] ــ ابن قدامة، المغني، 139/3. والنووي، المجموع، 282/6، والشوكاني، نيل الأوطار، 233/4.

2 ــ ابن قدامة، المغني، 147/3. والنووي، المجموع، 283/6.

3 ــ ابن حزم الظاهري، المحلى، 175/6.

4 ــ حمنة بنت جحش الأسدية: خوشكی زەینەبەی خێزانی پێغەمبەرە، یەکەم جار خێزانی موصعب کوڕی عمیر بوو، دوای شەهید بوونی لە ئوحد، تەلحەی کوڕی عبیدالله هێنای. أعلام النساء، كحالة، 2969/1.

دەچووە لای)). ((أنها كانت تستحاض وكان زوجها يجامعها)).[1] ئیمامی بەیهەقی ڕوایەتی کردووە.[2]

ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا چوونە لای ئافرەت لە کاتی خوێنداری جائیزە، هەر چەندە خوێنی لەبەر بڕوات. زۆربەی زانایان لە سەر ئەوەن، بەڵام ئیمامی ئەحمەد قەدەغەی کردووە، ئیبن سیرین دەڵێ: مەکروهە، چونکە تەنها ڕوایەی عیکریمە هەیە، ئەویش تەنها یەك هاوەڵ ئەو کارەی کردووە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی ڕاستی ودروستی لەسەر ئەو کارە نەداوە. ئیمامی ئەحمەدیش ئەو جۆرە جووتبوونەی بە هیچ شێوەیەك قەدەغە نەکردووە، مەرجیشی بۆ دانەناوە، ئەوەش ڕای زۆربەی زانایانە، وەك: ئیبن عەباس وسەعیدی کوڕی موسەیەب، کۆمەڵێك لە تابیعیەکان، بە بەڵگەی ڕوایەی عەکریمە کە ئەبو داوود ڕوایەتی کردووە،کەوا حەمنەی کچی جەحش خوێندار بووەو مێردەکەی تەلحەی کوڕی عەبدولاﷺ لەگەڵی جووت دەبوو، هەروەها ئوم حەبیبە خوێندار بووە مێردەکەی عبدالرەحمان کوڕی عەوفﷺدەچووە لای.ئەگەر جووتبوون لەگەڵ ئافرەتی خوێندار حەرام بووایە ئەوا پێغەمبەری خواﷺ بۆمانی ڕوون دەکردەوە.

ئەوانەی دەڵێن دروست نیە جووتبوون کاتی خوێنداری، بەڵگەیان ئەوەیە، کە عائیشەﷺ فەرموویەتی: خوێندار نابێ مێردەکەی لەگەڵی جووت بێت، چونکە ئازارو زیانی تیایە، چۆن هۆکاری قەدەغە کردنی جووتبوون لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ بریتیە لە بوونی ئازار، هەر هەمان هۆکار جووتبوون لەگەڵ ئافرەتی خوێندار قەدەغە دەکات، چونکە ئەویش ئازارو زیانی هەیە.[3]

---

1 ـ البيهقي، سنن البيهقي الكبرى، الرقم:1459، 329/1. وقال النووي: إسناده حسن.

2 ـ البيهقي:أحمد بن الحسين بن علي،أبوبكر. لە پێشەوایانی فەرموودەیە. لە دێی بەیهەقی سەر بە شاری خەسرۆجەرد/ نەیسابوور لە دایك بووە. پاشان چووەتە بەغداو کوفەو مەککە، فەزڵی زۆری هەیە لەسەر مەزهەبی شافیعی چونکە پاڵپشت وڕێکخەرو ڕوونکەرەوەی ڕایەکانی بووە. سونەنی کوبرای هەیە. لە ساڵی 458ك لە نەیسابوور کۆچی دوایی کرد . الزركلي، الأعلام،116/1. والذهبي، سير أعلام النبلاء، 163/18.

3 ـ الشوكاني، نيل الأوطار،346/1، وكذلك، 389/2، وابن قدامة،المغني، 339/1، وابن رشد، بداية المجتهد،49/1.

## برگەی پێنجەم: ڕای دانەر لەسەر نزیك بوونەوە لە ئـافرەتی خوێنـدار (وطء المستحاضة)

هەروەك باسمـان كـرد هۆكـاری تـووش بـوون بـە خوێنـداری زۆرە، هـەر جۆرێـك لەوانە نیشانەی تایبەتی خۆی هەیە. هـەروەها جـۆری ئـازار، ڕەنگـی خـوێن، بـۆنی خوێن، ماوەی خوێن هاتنە خوارەوە هەموو ئەوانە دەگۆڕێن لە نەخۆشیەك (هۆكار) بۆ نەخۆشیەكی تر.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەی لەسەرەوە باسمان كـرد، دەتـوانین كـرداری جووتبـوون لەگەڵ ئافرەتی خوێندار بكەین بە سێ بەشەوە لە ڕووی قەدەغـە كـردن یـان ڕێگـە پێدانەوە.

یەكەم: قەدەغە كردن لە دوو باردا(حالەت)

1- بوونی هۆیەكانی شوێنەواری، ئازارو زیانی تیایە وەك ئەوەی كە هەیە لە بێ نوێژی، چونكە هەموو ئەو نەخۆشیانە بەتایبـەتی (شـێرپەنجەو هـەو كـردن) خانـەو شـانەكانی ئـەو شـوێنە دەپوشـێنن و زامـداری دەكـەن، ئەگـەری زۆری هەیـە بـۆ گواستنەوەی ئەو هەوكردنـە بـۆ ئەندامـەكانی سـەرەوە وەك منداڵـدان وهێلكـەدان، هەروەها گواستنەوەی هەوكردنەكە بۆ پیاوەكەش بە هـۆی بەركـەوتنی ڕاسـتەوخۆ. مانەوەی ئەو هەوكردنە لـە ئافرەتـدا بـۆ ماوەیـەكی درێـژ خایـەن لەوانەیـە تووشـی نەزۆكی بكات بە هۆی گیرانی جۆگەی هێلكەدان.

2- سك پڕی و لەبارچوون، بە تایبەتی لەبارچوون لـە جـۆری هەڕشـە(الاسـقاط المهدد) و ژەهـراوی (الاسقاط التسممي) بـوون. لەبارچـوونی هەڕەشـە، چارەسـەری دەكرێت بەوەی ئافرەت ئاسوودەو حەساوە بێت لـە بـاری جەسـتەیی ودەرونـی بـۆ ماوەی دوو هەفتە. لەوانەیە بە هـۆی كرداری جووتبـوون لەبارچـوونەكە لـە جـۆری هەڕەشەوە زیاد بكـات وبگاتـە جـۆری حـەتمی كـە چارەسـەری نیـە. بـاری دووەم: جووتبـوون لـە كـاتی بـوونی لەبارچـوونی ژەهـراوی دەبێتـە هـۆی گواسـتنەوەی هەوكردنەكە وزیاد كردنی ئازارو زیانی.[1]

---

1 — درێژی جۆرەكانی لەبارچوون ولەباربردن لە بەشەكانی داهاتوودا باس كراوە.

دووەم: وا باشە(مستحب) کە جووتبوون نەکرێت لە کاتی بوونی هۆیەکانی نا ئۆرگانی، کە دەناسرێتەوە بەوەی خوێن هاتنێکی رێك، زۆر، بە ئازار. هەروەها جووتبوون نەکرێت لە کاتی بوونی لەبارچوونی تەواو.

سێیەم: قەدەغە نەکردنی جووتبوون لە کاتی خوێنداری بە هۆی نەخۆشیەکانی گشتی، کە دەبێتە هۆی ئاوسان، فراوان بوونی بۆڕیەکانی خوێن لە ناو کۆئەندامی زاوزێ، ئەوا جووتبوون ئازارو زیانێ ڕاستەوخۆی نیە. تەنها زیانی ئەوەیە، بوونی خوێن لەناو ئەندامەکانی زاوزێ وەك ناوەندێکە (وسـط - Media) بۆ گەشەی میکرۆبەکان، ئەوەش رێگە خۆشکەرە بۆ تووش بوون بە هەوکردن بەو میکرۆبانەوە ئەگەر ئەو ئەندامانە زوو پاك نەکرێنەوە لەو خوێنەی پێوەی لکاوە. ئەگەر پیاو خۆی بگرێ وجلەوی نەفس وئارەزووەکانی توند بکات دوور بکەوێتەوە لە جووتبوون، ئەوە پاکترو جوانترو باشترە، چونکە سروشت ونەفسی ئادەمیزادیش وایە لە خوێن دوور دەکەوێتەوە. والله أعلم.

# بەشی دووەم

# سك پڕی- دوو گیانی

## الحمـل ( Pregnancy )

باسی یەکەم : چۆنیەتی خولقانی کۆرپەلە

باسی دووەم: نیشانەکانی ئافرەتی سك پڕی

باسی سێیەم: پاشـــکۆکانـــی ســــــك پڕی

باسی چوارەم: حوکمەکانی ئافرەتی سك پڕ

# باسی یەکەم

# چۆنیەتی خولقانی کۆرپەلە

## ( تکوین- تخلق الجنین )

بەندی یەکەم: چۆنیەتی ڕوودانی پیتێن

برگەی یەکەم: سەرکەوتنی سپێرمەکان

برگەی دووەم: پیتێنی هێلکە

بەندی دووەم: قۆناغەکانی دوای پیتێن

برگەی یەکەم: دابەش بوونی هێلکەی پیتێنراو

برگەی دووەم: قۆناغی هەڵواسراوە

برگەی سێیەم: قۆناغی گۆشتە جۆراو

برگەی چوارەم: جولانی کۆرپەلە

بەندی سێیەم: ماوەی سك پڕی

## بەندی یەکەم: چۆنیەتی ڕوودانی پیتێن

### بڕگەی یەکەم: سەرکەوتنی سپێرمەکان

لە نیوەی مانگدا هێلکە پێدەگات و دەکەوێتە خوارەوە وقامچیەکانی دەوروبەری هێلکەدان ڕایدەکێشن وپاڵی دەدەن بەرەو ناو جۆگەی هێلکەدان. لە نیوەی جۆگەی هێلکەدان یەکێك لە سپێرمەکان لەگەڵی جووت دەبێت بۆ پیتێن. ئەگەر لە نێوان هەردوو هاوسەر جووتبوون ڕوویدا بێ، ئەوا سپێرمەکان بە خێرایەکی زۆر بەرەو هێلکە سەر دەکەون و لە نێوان خۆیان پێشبڕکێ دەکەن تاوەکو بگەنە هێلکەو تەنها یەکێکیان دەتوانن پیتێنی لەگەڵدا بکەن(کامەیان خێراترو بەهێزترو بێت- ئەوەی خوای گەورە بە قەدەر بۆی داناوە). ژمارەی ئەو سپێرمانەی سەر دەکەون 300 ملیۆنە[1]، بەلام تەنها 200 سپێرم[2] لە کۆتایی پێشبڕکێ یەکەدا دەتوانێ بگاتە دەوروبەری هێلکە چونکە ماوەکەی دوورودرێژە نزیکەی 30-40 سم دەبێت. پێویستە سپێرم ئەو ماویە ببڕێت بەناو کۆئەندامی زاوزێ تاوەکو دەگاتە هێلکە، لەو کات سەری لە دیواری هێلکە دەدات بۆ چوونە ژوورەوە، بەهۆی دەردانی ئێزایمەکی تایبەت بەناوی ئەکرۆسین (Acrocin) دەتوانێ دیواری هێلکە ببڕێت، ئینجا سپێرم لەناو هێلکەدا دەتوێتەوە وپیتێن ڕوودەدات(الإخصاب- Fertilization).[3]

دیواری هێلکە زۆر پتەوە سپێرم ناتوانێ لە هەموو شوێنێکەوە بچێتە ژوورەوە، بەڵکو شوێنی تایبەت هەیە بەناوی(شوێنی تەنك- منطقة الشفاف Zon- pellucida)[4] یان پێ یان دەڵێن ناوچەی پێشوازی کردن لە سپێرم. هەرکات پیتێن

---

1 ـ لە هەر جووت بونێکدا پیاو 5-6 میلیلتر شلەی توخمی فڕێ دەدات، هەریەك میلیلتریش لەو ناوە نزیکەی 50-60 ملیۆن سپێرم هەیە، واتە کۆی گشتی دەکاتە 300 ملیۆن. بڕی ئەو شلەو ژمارەی سپێرمەکان دەگۆڕێ لە پیاوێك بۆ یەکێکی تر، لە کاتێك بۆ کاتێکی تر لە هەمان پیاودا.

2— *Kenneth. Principle & Practice of Endocrinology. P: 855.*

3— *Stuart&Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 37.*

4 —*Kenneth. Principle & Practice of Endocrinology. P: 881.*

ڕوویدا لەگەڵ یەك سپێرم ئەوا ئەو ناوچانەی پێشوازی لەسەر دیواری هێلکە هەڵدەگیرێن وهیچ سپێرمەکی تر ناتوانێ بچێتە ناو هێلکە هەرچەندە زۆر بەهێزیش بێت. ئەگەر ئەو ڕووداوەش ڕوویدا ئەوا دەبێتە هۆی کوشتنی هێلکەو سپێرمی یەکەم، هەروەها سپێرمی دووەم. بەمەش کۆرپەلە هەرگیز دروست نابێت. ئەو ڕووداوە نا دروستە گەر ڕوویدا ئەوا لە زانستی پزیشکی پێی دەڵێن: (سك پڕی هێشوویی–الحمل العنقودی– Hydatidiform mole ) ئەگەر ئەو نەخۆشیە چارەسەر نەکرێت بە نەشتەر گەری ئەوا ئافرەتەکەش دەمرێت، یان تووشی شێرپەنجە دەبێت لە داهاتووەکی نزیکدا. ئەو ڕووداوەش بەلگەیەکی زۆر زانستیانەیە لەسەر ئەوەی دەبێ هەر ئافرەتێك بۆ یەك پیاو بێت، هەرکات زیاتر لەیەك پیاو چوونە لای ئافرەتێك ئەوا شێواندن وتێکدانی باری هاوسەریەتی وخێزان وکۆمەلگەیە، تێکەلاوی نەوەکانی بە دواوەیە وکەس منداڵی خۆی ناناسێ وکێشەی میراتیش سەرباری هەموو کێشەکانی تر، هەموو شەریعەتەکانی ئاسمانی ئەو جۆرە هاوسەریەتیەیان قەدەغە کردووە ولە واقیعیشدا سەر ناگرێ چونکە کێشەی زۆری بەدواوەیە وئەمەش کۆتایی ژیانی مرۆڤایەتی یە.

ئەو ناوچانەی پێشوازی ڕۆڵی زۆریان هەیە لە کرداری پیتێن:[1]

1– چونکە هەندێ جینی تایبەتی پێشوازیکەری تیایە تاوەکو سەرنجی سپێرمەکان ڕاکێشێ بۆ لای هێلکە (Capacitation).

2– ناهێلن (فرە پیتێن) ڕوویدات، واتە دوای پیتێن بەرگری دەکەن لە چوونە ژوورەوەی سپێرمەکانی تر. چونکە ئەو ناوچانە جینێکی تر لە خانە دروست دەکەن وڕێکی دەخەن بە ناوی پێشوازیکەری جۆری تایبەت ( Species specific receptersed) وەك هێلی بەرگری دژی فرە سپێرمی (اللقاح المتعدد– Polysperm )، لە هەمان کاتدا ناوچەکانی پێشوو پێشوازی هەڵدەگیری ونامینی.

---

1 – *Kenneth. Principle & Practice of Endocrinology. P: 782.*

3- هەر ئەو ناوچانەن هاوکاری هێلکەی پیتێنراو دەکەن بۆ گەیاندنی بە سەلامەتی بۆ ناو منداڵدان.

ئەو دیمەنە سەرسوورهێنەرە کە دەیبینین، هێلکە وەك(بووك) خۆی رازاندۆتەوەو سپێرمەکانیش ماندوو شەکەتن، پێشبڕکێ دەکەن بۆ گەیشتنە ئاواتیان، پاش ڕوودانی پیتێنی هێلکە بەو سپێرمەی خوای گەورە دیاری کردووە، ئەوا ئەوانی تر هەموو دەمرن لە داخانا، یان سەری خۆیان بەدیواری هێلکە دەدەن ولەناو دەچن چونکە پێشوازیان لێ ناکرێت. چۆن پێشوازیان لێ بکرێت ئەوا هێلکە بۆتە خاوەن هاوسەرو ماڵ و حاڵی خۆی، چۆن ماڵی خۆی تێك دەدات بۆ یەکێکی تر. ئەو ڕووداوانە کە بەو شێوەیە دەیبینین بە ڕاستی ڕێك وپێکی وکردار جوانی وحیکمەتی خوای گەورەمان بۆ دیار دەکەوێت لە هەموو کارەکانی. چونکە ئەگەر هەر 200 سپێرم پیتێنی بکردایە، هەر جارێك ئافرەت 200 منداڵی بوایە، ئەوا دەبوایە ژیانی ئەو ئافرەتە پێش منداڵبوون ودوای منداڵبوون وژیانی خێزان وکۆمەڵگەو باری ئابووری جیهان چی بەسەر بهاتایە. بەڕاستی خوای گەورە خاوەن بەزەیی و حیکمەتە، جا ئەو حیکمەتە زانستی سەردەم وزانایان بیزانن یان نا، ئەوا هەموو کارەکانی چ پەنهانی چ دیارەکان هەمووی بە سوود وقازانجی مرۆڤایەتیەو پڕیەتی لە حیکمەت.

### بڕگەی دووەم: پیتێنی هێلکە (نطفة الأمشاج - Fertilized Ovum).

لە کاتی پیتێن هێلکە ئەو بەرگە جوانەو کڵاوە زێرینەی کە لەسەر سەری بوو (کە بۆ سەرنج ڕاکێشانی سپێرمەکانە) دادەکەنێ ودیوارێکی ئەستوور دروست دەکات تاوەکو سپێرمی تر نەچنە ژوورەوە. پاش ئەوەی هێلکە ژیانی خۆی وهاوسەرەکەی دابین کرد ودڵنیا بوو لە هێرشەکانی دەرەوە، ئەوا خەریکی کارەکانی ناو ماڵی خۆی دەبێت وەك دابەش بوون، بەرەو پێشەوەچوون، هەروەها ڕۆڵی کرۆمۆسۆمەکان دێت بۆ کۆنترۆل کرداری خولقانی کۆرپەلەو بەرەو گەشە بردنی.[1]

---

1 – Ronald.W.Dudek. High-yield Embryology. P: 6.

کرۆمۆسومەکان- بۆیە ڕەنگیەکان- تەحەککوم دەکەن بە چۆنیەتی خولقانی کۆرپەلە بەو بەرنامەی خوای گەورە بۆیانی داڕێژشتووە. کۆرپەلە گەشە دەکات لە ماوەی نۆ مانگدا، سیفەتەکانی ئەو کۆرپەلەیە بە هۆی ئەو بۆماوانەوە دیاری دەکرێت کە لەسەر کرۆمۆسومەکانەوە دابەش بوون. لەسەر هەر کرۆمۆسومێکدا 100000-30000 بۆماوە هەیە، بەهۆی سێ جۆر بۆماوە خولقانی کۆرپەلە ڕێك دەخرێت، یەکەمیان: بۆماوەکانی پێکهێنان ودروست کردن (التكوين و البناء)، دووەمیان: بۆماوەکانی ڕێکخستن وتەسویە کردن (التنظيم و التسوية)، سێیەم: بۆماوەکانی شێوەو دیمەن وڕوکار (الشكل و الصورة).[1]

## بەندی دووەم: قۆناغەکانی دوای پیتێن

### بڕگەی یەکەم: دابەش بوونی هێلکەی پیتێنراو

هێلکە دەست دەکات بە دابەشبوونی یەك لەدوای یەك، واتە دەبێتە دوو خانە، چوار، هەشت، شانزە، سی ودوو خانە، ئەوکات پێی دەڵێن (شێوە توو- التوتة - Morulla). پاش چەند ڕۆژێك شێوەی گۆ- تۆپ وەردەگرێت، دوایی ئەو گۆیە پڕ دەبێت لە شلە، ئەو کات پێی دەڵێن تورەکەی میکرۆبی یان گۆی میکرۆبی ( الكرة الجرثومية-Blastula- Blastocyst ).[2] ئەو کردارەش 1-7 ڕۆژ دەخایەنێ.

هێلکەی پیتێنراو بە جۆگەی هێلکە دەچێتە خوارەوە بۆ ناو منداڵدان، ئەو ڕێگایەش چوار ڕۆژی دەوێت، هەر لەو ماوەیەشدا منداڵدان خۆی ئامادە دەکات بۆ وەرگرتنی ئەو میوانە خۆشەویستە. لە هەمان کات زەردە تەنی (الجسم الأصفر- Corpus Leutium ) ناو هێلکەدان هۆرمونی پروجیسترون دەردەدات بۆ ئەوەی کرداری سك پڕی بە ڕێوە بچێت، چونکە ئەو هۆرمونە بە هۆرمونی سك پڕی ناسراوە بەبێ هاوکاری ئەو، هەرگیز کۆرپەلە گەشە ناکات.

---

1 ـ الشريف، عدنان، من علم الطب القرآني، ص159.

2_ *Sperber G.H. Craniofacial Embryology. P: 12.*

## بڕگەی دووەم: قۆناغی هەڵواسراوە (مرحلة العلقة- Implantation)

واتای هەڵواسراو(العلقة):(لەگەڵی دایەو لێی جیانابێتەوە، دڵی پێوەی بەندەو خۆشی دەوێت، چۆتە ناو پەردەی دڵی).[1]

هێلکەی پیتێنراو هێلانە بۆ خۆی دابین دەکات لە ناو دیواری ناوەوەی منداڵدان دوای 7-8 ڕۆژ پاش دەرچوونی لە هێلکە دان. بەدیواری سەرەوەی پشتەوەی منداڵدان خۆی هەڵدەواسێ ولەسەرەخۆ دەچێتە ناو قوڵایی دیوارەکەی، خواردنی خۆشی دابین دەکات.[2] خانەکانی دەرەوەی هەڵواسرلوە کە خانەی جیانەکراوەن (خلايا الخارجية- غيرالمتميزة Undifferentiated) ڕاستەوخۆ خۆی دەبەستێتەوە بە بۆرییەکانی خوێنی دیواری منداڵدان بۆ دابین کردنی خۆراکی کۆرپەلەکە، بەڵام خانەکانی ناوەوەی هەڵواسراوە ئەرکی دروست کردنی کۆرپەلەو پەردەکانی دەوروبەریەتی، بەو جۆرە خانانە دەوترێت خانەی خولقێنەری جیاکراوە(الخلايا المخلقة- المتميزة "Differentiated" في مرحلة المضغة).[3]

لە ڕۆژی نۆیەم دەبینین هەڵواسراوە خۆی بەتەواوی خستۆتە ناو قوڵایی دیواری منداڵدان، ڕۆژ بە ڕۆژیش خوێنی زیاتری بۆ دەچێت بە گوێرەی بڕی گەشەی ڕۆژانەی کۆرپەلەکە. ئەوەی جێگەی سەر سووڕمانە ئەوەیە کەوا ئەو شتانەی بە سوودن بۆ کۆرپەلە بەهۆی ئەو تۆڕە بۆریە خوێنانە دەگاتە کۆرپەلە وئەو شتانەشی زیان بەخشە قەدەغەی دەکات.

لە ڕۆژی 9-14 گۆڕانکاری زۆر ڕوو دەدات لە ژمارەی بۆریە خوێنەکان ودیواری منداڵدان تاوەکو دەگاتە ئەوەی دەریاچەیەك لە خوێن درروست دەبێت. لە هەفتەی سێیەمەوە بارستە خانەی ناوەوە بۆ دوو چینە خانە جیا دەکرێتەوە: چینی دەرەوە کە پێی دەڵێن(Ectoderm)، چینی ناوەوەش پێی دەڵێن

---

1ـ لسان العرب، ابن منظور، 357/9.

2ـ *John W. Hole, JR. Human Anatomy &Physiology. P: 835-830.*

3 ـ *Langsman. Medical Embryology. P: 49-52.*

(Endoderm)، پاشـــان چـــینی ناوەڕاســـتیش دروســـت دەبێـــت پێـــی دەڵـــێن (Mesoderm).

لە کۆتایی هەفتەی سێیەم تەختەی کۆرپەلە لە شێوەی خڕ دەگۆڕێ بۆ شێوەی هەرمێی، کە لای سەری فراوانەو لای خوارەوەی تەسکە. ئەو تەختـەی کۆرپەلـەش لە سێ چین پێکهاتووە.[1]

## بڕگەی سـێیەم: قۆنـاغی گۆشـتە جـۆراو (مرحلة المضغة أو التخلق- تكوين الأعضاء - Organ genesis).

واتای گۆشـتە جـوراو (المضغة): (مَضَغَ: يَمْضَغُ ويمضُغُ: لاك. وأمضغه الشيء ومضَغه: جوين، پارچە گۆشتێکی بچوك بە هێندی دەمی ئادەمیزادێك).[2]

لە سەرەتای هەفتەی چوارەم بارستەی جەستەیی (الكتـل البدنيـة Somites) دروست دەبێـت، لـەلای سـەریەوە بـۆ لای خـوارەوە، دوای تـەواو بـوونی ژمارەیـان دەگاتە 42-44 بارستە لە هەر لایەکەوە. ئەو بارستەیەش لەو قۆناغەدا دیارترین و باشترین نیشانەیە کەپێوەی بناسرێتەوە، هـەر لەسـەر ئـەو بارستەشـە کۆئەنـدامی پەیکەرە ئێسکان وماسولکە دروست دەبـن. هـەر ئـەو بارستەشـە شـێوەی گۆشـتی جۆراو دەگەیەنێ لە دوای قۆناغی هەڵواسراوە.

پاش دیار کەوتنی ئەو بارستەیە کۆئەندامی دەمارو بۆڕیەکانی خوێن دەست بـە گەشـەی تـەواو دەکـەن، بەمـەش سـووڕی خـوێنی کورپەلـە تـەواو دەبێـت ودەبەسترێتەوە بە خوێنی وێلاش ودایکی، بەمەش کۆرپەلە خواردنی ڕاستەوخۆ لـە دایکی وەردەگرێ و ئەندامەکانی تری دەست بە جیابوونەوە وتایبەتمەنـدی دەکـەن (التميّز).[3]

---

*1– Sperber G.H, Craniofacial Embryology. P: 21.*

2 ــ لسان العرب، ابن منظور، 129/13.

*3 – Langsman . Medical Embryology. P: 64.*

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە قۆناغى گۆشتە جوراو بە دوو باردا تێدەپەڕێت:
بارى يەكەم: بريتيە لە قۆناغى جيانەكردنەوە (مرحلة غير مميـزة)، چونكە هێشتا هيچ ئەندامێك شێوەى خۆى وەرنەگرتووەو خۆى جيانەكردۆتەوە. ئەو قۆناغەش لە سەرەتاى هەفتەى سێيەم دەست پێدەكات تاوەكو كۆتايى هەفتەى چوارەم. بەو قۆناغە دەڵێن قۆناغى گۆشتە جوراوى نەخولقاو (مرحلة المضغة غير المخلقة).

بارى دووەم: دەست پێدەكات لە هەفتەى پێنجەم تاوەكو كۆتايى هەفتەى حەوتەم، كە تيايدا بارستەى جەستەيى دەگۆڕێ بۆ ئێسكانەكان ودوايش بە ماسولكە دەورەدەدرێن ودادەپۆشرێن، هەروەها ئەندامەكان شێوەى خۆيان وەر دەگرن وخۆيان جيا دەكەنەوە. كۆ ئەندامى هەرس وپەنكرياس وجگەرو چاوو گوێ، لە دواى ئەوان كۆ ئەندامى هەناسەو لەدواتر كۆ ئەندامى ميزەڕۆ جيادەكرێنەوە. بەو قۆناغەش دەڵێن: (مرحلة المضغة المخلقـة).[1] دواى ئەو سێ قۆناغە سەرەكيەى باسمان كردن(تووتەو هەڵواسراوەو گۆشتە جوراو) ئينجا بەو مەخلوقە نوێ يە دەلێن (هەلگيراو- الحميل- Embryo).

تاوەكو ئەو قۆناغەش كۆرپەلەى ئادەميزاد و زۆربەى گيانلەبەرانى تر بەيەك دەچن وناتوانرێ بە ئاسانى بە شێوەو ڕوكار جيا بكرێنەوە.

لێرەوە خاڵێكى زۆر گرنگ سەر هەڵدەدات وزانايانى سەرسووڕمان كردووەو تاوەكو ئێستا وەلاميان بۆ نەدۆزيتەوە[2]، ئەويش ئەمەيە: ئايا بۆچى خانەكانى لەشى كۆرپەلەى ساوا هەر كۆمەڵێكيان تەنها يەك سيفەت دەگوازنەوە ويەك ئۆرگان دروست دەكەن، بۆچى هەموو ئۆرگانەكان دروست ناكەن، هەرچەندە هەر خانەيەك هەموو سيفەتەكانى ترى لەشى تيايە؟ هەروەك ئاشكرايە كەوا بۆماوەكان

---

*1- Langsman. Medical Embryology. P: 83*
*–Ronald.W.Dudek. High-yield Embryology. P: .14*
*–Sperber G.H. Craniofacial Embryology. P: .24*

2 — ئەوەى ڕاستيە تاوەكو ئێستا تەفسيرو وەلامێكى ماددى وتەوريان بۆ نەدۆزيوەتەوە، ئەگينا خۆى وەلامى هەيە- دانەر.

سیفەتەکان دەگوازنەوە لە دایك وباوك بۆ نەوەکانی، هەر یەك لە خانەکانی کە دروست دەبن دوای پیتێنی هێلکە هەموو سیفەتەکانی ئەو ئادەمیزادەی (کۆرپەی) تیایە کەلە دوای چەند مانگێك لە دایك دەبێت، بەلآم کاتی خولقاندن ودروست بوونی کۆرپەلە هەر کۆمەڵە خانەیەك تەنھا یەك کار ئەنجام دەدەن وتایبەتمەندی دەنوێنن بۆ دروست کردنی یەك جۆر لە ئەندام، هەرچەندە لەناو زاکیرەو میمۆری خۆی هەموو زانیاریەکانی ئەندامەکانی تری لەشی تیایە، بەلآم ئەو زانیاریانەی تر ناخوێنێتەوە بێجگە لەو زانیاریانەی کە بۆی دیاری کراوە، ئایا چی وای لێ کردووە ئەو جۆرە هەڵسووکەوتە بکات؟ پرسیارێکی بێ وەلآم لە لای زانایانی دوور لە خواو دەسەلآتەکانی. وەلآم: هەرچەندە هەموو خانەکان هەموو زانیاریەکانیان تیایە دەربارەی لەش بەگشتی، بەلآم خوای پەروەردگار هەر کۆمەڵە خانەیەك ڕێگەی بۆ دیاری کردووەو هیدایەتی داوە، کە تەنھا یەك جۆر شانەو ئەندام دروست بکەن، تەنھا ئەو سیفەتە بۆماوەییانە بخوێننەوە، کە لەسەر کرۆمۆسۆمەکانەوە هەیە، کە تەنھا پەیوەندیدارە بەو ئەندام و ئورگانەوە، زانیاریەکانی تر پشت گوێ بخەن، هەر بۆیە کۆمەڵە خانەیەك تەنھا پەیوەندی دارە بە دروست کردنی چاو، ئەوانی تر پەیوەندی دارن بە دروست کردنی کۆئەندامی هەرس ...هتد. بەلآم ئەگەر ویستی خوای گەورە وابوو بۆماوەکان زانیاریەکان بە هەڵە بخوێننەوە، یان شوێنی بۆ ماوەکان بگۆڕدرێ ئەوا کۆرپەیەکی ناتەواو دروست دەبێت، کە لە زانستی پزیشکی ناسراوە بە بازدانی بۆماوەیی (الطفرات الوراثية- Mutation ).[1]

زانا لۆرانس ئالان دەڵێت: جێگەی سەرسووڕمانە لە زانیاری بایۆلۆژی دا، کەوا بۆماوەکان هەمان زانیاریان هەیە، بەلآم دوایی هەریەکیان تایبەتمەندی خۆیان دەنوێنن لەکاتی دروست بوونی خانەکان، بەمەش جیاوازی شانەو ئەندامەکان دەردەکەون لە شێوەو کارو کرداردا.[2]

لە کۆتایی هەفتەی هەشتەم قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات، هەڵگیراو شێوەی

---

1 ـ توفيق، محمد عز الدين، دليل الأنفس بين القرآن الكريم والعلم الحديث، ص132.
2ـ آلان، لورنس، جسم الإنسان، ص77.

دەگۆڕێ بۆ شێوەی ئادەمیزاد، هەموو کۆئەندامەکانی تەواو دروست بوونە، ئەو کاتە پێی دەڵێن (کۆرپەلە- الجنین-Fetus)[1] ولە کۆرپەلەی گیانەورانی تر جیا دەکرێتەوە. لەو کاتەوە تاوەکو کاتی منداڵبوون ئەوا تەنها گەشە ونەشونما دەکات وگەورە دەبێت، بەڵام هیچ گۆڕانکاری تر لە شێوەو ئەندامەکان ڕوو نادات، چونکە شێوە ودیمەنی کۆتایی وەرگرتووە.[2]

لە کۆتایی ئەو قۆناغانەدا، چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەهێنمەوە کە تیایدا باسی قۆناغەکانی پیتێن وهەڵواسراوەو گۆشتە جوراو وخولقاندن وروح دەکات، لەگەڵ بڕیاردانی شێوەو ئاکاری دەرەوەو ناوەی ئادەمیزاد. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴾ الحج:5 لەو ئایەتەدا قۆناغەکانی خولقانی کۆرپەلەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەهەمان شێوەو ڕیزبەندی کەوا زانستی سەدەی بیستەم پێی گەیشتووە. هەروەها باسی ئەو نهێنیە دەکات کەوا قۆناغی گۆشتە جوراو لە دوو باری جیادا خۆی دەنوێنێ (نەخولقێنەرو خولقێنەرو ) هەروەك باسمان کرد.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا

---

1 ـــ کۆرپەلە لە تەمەنی یەك ڕۆژی تاوەکو هەفتەی هەشتەم پێی دەڵێن: هەڵگیراو- کۆرپەلەی پێنەگەیشتوو (الحمیل-جنین غیر ناضج- Embryo)، لە هەفتەی هەشتەم تاوەکو منداڵبوون پێی دەڵێن: کۆرپەلە (الجنین- Fetus).

2 _ *Sperber G.H. Craniofacial Embryology. P: 25.*

﴿ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ﴾ المؤمنون:12-16. ئەو ئایەتانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەوا چۆن ئەندامەکان دەگەنە قۆناغی تایبەتمەندی وجیابوونەوە، هەروەها باسی ئەوە دەکات کەوا چۆن یەکەم جار ئێسقان دروست دەبێت دوایی بە ماسولکە دادەپۆشرێ. بۆ زانینی خوێنەرانی بەڕێز تاوەکو سەدەی بیستەمی ڕابووردو هەر وا گومان بوو لای زانایان کەوا ماسولکە دروست دەبێت دوایی ئێسقان چونکە خانەکانی ئێسقان ئالۆزترو پێشکەوتوو ترە لە خانەکانی ماسولکە، دوای چەند ساڵ وتوێژینەوەیەکی زۆر گەیشتنە ئەوەی کەوا بەپێچەوانەوەیە، ئێسقان دروست دەبێت دوایی ماسولکەکان دایدەپۆشن، کەواتە هەردەبێ فەرموودەی خوای گەورە ڕاست بێت، جا خوای گەورە چی فەرمووە لە قورئانی پیرۆز هەر ئەو بڕیاری کۆتایی و زانیاری تەواوە جا زانایان بیزانن یان نا، پێشکەوتنی زانستی پێی گەیشتووە یان نا؟ لەوانەیە هەندێ زانیاری ناو قورئان هەبێ هەر زانیاری مرۆڤ پێی نەگات تا ڕۆژی دوایی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ السجدة: 7-9. ئەو ئایەتانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کەوا خوای گەورە وەڵامی ئەو پرسیارەی کەوا زانایانی سەرسووڕمان کردووە دەداتەوە، کەوا هەر زاتی پاکی خۆیەتی فەرمان دەداتە خانەکان بۆ تایبەتمەندی وخولقانی شانە و ئەندامەکان بەهۆی ئەو نەفخە ڕوحەی، کە دەیخاتە ناو خانەکان. هەروەك چۆن فەرمانی بەو برە کەمە هۆرمونانە داوە کە ئەو کارە سەرسووڕ هێنەرانە ئەنجام بدەن لە جوولانی هێلکەو ئامادەکردنی منداڵدان بۆ لەباوەش گرتنی ئەو مەخلوقە نوێ یە. بە هەمان شێوە دەبینین کەوا چۆن ئەندامەکان کارەکانیان دابەش کردووە لە نێوان خۆیان،

بەتایبەتی ڕژێنەگلاندەكان.(بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی كار و فەرمانی هۆرمونەكان بڕوانە كیتابی دانەر (پیاوان و ژنان تەوكاری نا یەكسان).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾ الانفطار:6-9.

ئەو ئایەتانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەكەنەوە كەوا خوای گەورە پاش خولقاندنی ئەندامەكان، شێوەی تایبەت بەو كۆرپەلە نوێ یە دەبەخشێ، كە كۆرپەلە خۆشی نازانێ چی بۆ دیاری كراوە، بە ویستی خۆی نیە كە شێوەی خۆی وجوانی ڕێكوپێكی دیاری بكات، هەروەك لە یەكێك لە فەرموودەكان هاتووە كەوا خوای گەورە هەر لەو كاتەوە ڕزق وڕۆزی وئەجەل وباری ژیانی لە خۆشی وناخۆشی بۆ دیاری دەكات.

## برگەی چوارەم: جوڵانی كۆرپەلە

ئەو قۆناغەش لە كۆتایی مانگی سێیەم وسەرەتای مانگی چوارەم دەست پێدەكات، كەوا كرداری بەیەكەوە گەیشتنی كۆئەندامی دەمار لەگەڵ ماسولكەكان وئەندامەكانی تر ڕوو دەدات. بەمەش ئەندامەكان لە كۆئەندامی ناوەندی دەمار فەرمان وەردەگرن، كۆرپەلە دەست بە جولەی خۆ ویست دەكات، لەناو منداڵدان خۆی هەڵگێڕو وەرگێڕ دەكات، ئافرەتەكەش هەست بەم جوولەیە دەكات. هەر لەو كاتەوە دەبێتە ئادەمیزادێكی سەربەخۆ وخاوەن كیانی تایبەت، وبەهۆی خەتەكانی سەر پەنجەی گەورەی جیا دەكرێتەوە لەگشت مرۆڤەكانی تری سەر زەوی.[1]

دووبارە زانایان لە سەدەی ڕابوردوو گەیشتنە ئەوەی كەوا ناسینەوەی ئادەمیزادان بە شێوەیەكی زانستی بەهۆی ئەو هێڵانەی سەر پەنجەی گەورەی دەستیەتی، چونكە هەرگیز شێوەی ئەو هێڵانە لەیەكێك بە ئەوی تریان ناچێت هەرچەندە جمك وبرا بن، هەر لەڕۆژی دوایش خوای گەورە ئەو هێڵانە دروست

---

[1] — *Langsman. Medical Embryology. P: 112.*
- *Sperber G.H. Craniofacial Embryology. P: 25.*

دەكاتەوە پاش ئەوەی لەژێر گل وخۆڵدا ڕزی دەبن. هەروەك دەفەرمووێ:﴿ بَلَىٰ قَادِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ۝٤ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴾ القيامة: 3-4.

## بەندی سێیەم: ماوەی سك پڕی (مدة الحمل)

ماوەی سگ پڕی 40 هەفتەیە واتە280 ڕۆژە، بە تێكڕایی 37-40 هەفتەیە.[1] كە لە یەكەم ڕۆژی دوایین بێ نوێژی حیساب دەكرێت پێش ئەو سك پڕیە(Lastmenstrual period-LMP [2]

لە واقیعدا پیتێنی هێلكە ڕوو دەدات پاش دەست پێكردنی بێ نوێژی بە دوو هەفتە بەڵام زانایان دەڵێن: لەبەر ئەوەی ڕۆژی هاتنە دەرەوەی هێلكەی پێگەیشتوو لە ناو هێلكەدان دیار نیە بە شێوەیەكی قەتعی، بۆیە بڕیارن داوە كەوا یەكەم ڕۆژی دەست پێكردنی دووایین بێ نوێژی بریتیە لە سەرەتای سك پڕی. كورترین ماوەی سك پڕی كە كۆرپەلە دەتوانێ بژی دوای لە دایكبوون دەگاتە 6 مانگ، درێژترین ماوەی سك پڕیش دەگاتە یەك ساڵ.

هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾ الأحقاف: 15

وقال سبحانه:﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ ﴾ لقمان: 14

هەروەها فەرموویەتی ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾البقرة: 233.

---

*1 – Stuart.Combell&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 2.*

*2– Stuart.Combell&Cristoph . Obstetric by ten teachers. P: 2*

لەو دوو ئایەتە بۆمان دەردەكەوێت كەوا سك پڕی وشیر پێدانی تەواو دەگاتە 30 مانگ، شیر پێدانی تەواو خۆی 24 مانگە واتە دوو ساڵ. كەواتە 30 –24– 6 مانگ. لێرەوە دەردەكەوێت كەوا كورترین ماوەی سك پڕی دەگاتە6 مانگ.

ئەو كردارە بیركاریە ئیمامی عەلی و ئیبن عەباس ﷺ دەریان هێناوە لەو دوو ئایەتەی قورئانی پیرۆز، لەو كاتەی كە ئیمامی عوسمان ﷺ خەلیفە بوو، ئافرەتێكیان هێنا كە منداڵی ببوو بە 6 مانگی، ویستیان حەدی لێ دەر بكەن، گوایە زینای كردووە. بەڵام پێش جێبەجێ كردنی ئەو فەرمانە، ئەو حیسابانەیان ڕوون كردنەوە كە لەو دوو ئایەتەوە هاتووەو فەرمانەكە كۆتایی پێهاتوو، ئافرەتەكە بە ڕێ كراوە بۆ ماڵی خۆی.[1]

1ـ القرطبي، محمد بن أحمد، الجامع لأحكام القرآن، 193/16.

# باسی دووەم

# نیشانەکانی ئافرەتی سك پڕ

## ( Symptoms & Signs -أعراض الحمل )

بەندی یەکەم: نیشانەکانی بەهۆی پاڵەستۆی سك پڕی

بەندی دووەم: نیشانە گشتیەکان

بەندی سێیەم: نیشانەکانی دەرونی ودەماری

### باسی دووەم: نیشانەکانی ئافرەتی سک پڕ

هەموو گیانی ئافرەت گۆڕانکاری بەسەردا دێت لە کاتی سک پڕی، لەبەر گۆڕانکاری هۆرمونەکان و گۆڕانکاری لە مەمك وئۆرگانەکانی تر.

ئەو نیشانانەی لە ئافرەتی سك پڕ دیار دەکەوێت دەبێتە سیٚ بەشەوە:

### بەندی یەکەم: نیشانەکانی بەهۆی پاڵەستۆی سك پڕی

ئەو منداڵدانەی کە پێش سك پڕی تەنها قەبارەی 5 میلیگرام[3] هەیە، کاتی سك پڕی توانای زیاتر لە 5000 میلیگرام[3] هەیە، ئەوەش بەم شێوەی خوارەوە دابەش بووە: 3500 میلیگرام بۆ کۆرپەلە، 1500 میلیگرام کێشی شلەی ئەمنیۆنی، 500 میلیگرام کێشی وێڵاش. ئەوەش مانای ئەوەیە قەبارەی منداڵدان لە کاتی سك پڕی هەزار جاری پێش سك پڕیە. کێشی منداڵدانیش 15-20 جاری خۆی زیاد دەکات، لە 50-75 غرامەوە دەگاتە 1200 گرام کاتی سك پڕی. لە دوای منداڵبوون قەبارەو کێشی منداڵدان دەگەڕێتەوە باری جارانی خۆی لە ماوەی 6-7 هەفتە.

لە کاتی سك پڕی کێشی ئافرەتیش 11-13 کیلۆگرام زیاد دەکات، لەو کێشە زیادە 5-8 کێشی کۆرپەلەو شلەی ئەمنیونی و وێڵاشە، ئەوی تریش کێشی شلەی زیاد بووە[1]. ئەو کێشە زیادە پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر ئۆرگان وئەندامەکانی دەوروبەری خۆی وهەندیٚ نیشانەی تایبەتی لیٚ بەدیار دەکەوێت.

1- دروست بوونی باو بژ لە ریخۆڵە بەهۆی پاڵەپەستۆی منداڵدان لەسەریان وای لیٚ دەکات کە تووشی تەمەڵی ببیٚ وکارەکانی بە رێکی بە رێوە نەچێت، بەمەش خواردن لە ناو ریخۆڵەکان دەمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی زیاتر ودەترشێت وباوبژ دروست دەبێت، هەروەها بەرگری لە چوونە دەرەوەی ئەو باوبژەش دەکات.[2]

---

1- *Stuart.Combell&Cristoph lees . Obstetric by ten teachers. P: 45.*

2- *Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 780.*

2- قەبزی: ئەوەش بەهۆی هەمان میکانیزمی سەرەوەیە، لەگەڵ گۆڕانی بڕی هۆرمونەکانە.[1]

3- فراوان بوونی بۆڕیەکانی خوێنی قاچ ودروست بوونی دەوالی (الدوالي- Varicose vein): ئەوەش بە شێوەی بۆڕی خوێنی ڕەنگ شینی پێچاو پێچ دەردەکەوێت لە ژێر پێستە، زۆر جاریش ئازاری هەیە. ئەوەش بە هۆی پەستانی منداڵدانە لەسەر بۆڕیە خوێن هێنەرە گەورەکانی قاچ و بەرگری گەڕانەوەی ئەو خوێنەیە لە قاچەوە بۆ ناو دڵ.[2]

4- مەیاسیری (البواسیر- Haemorrhoid ): بریتیە لە فراوان بوون وگیرانی ئەو خوێن هێنەرانەی ناو ڕاستە وکۆم کە دروست دەبێت بەهۆی قەبزی وبەهۆی پاڵەپەستۆی منداڵدان لەسەریان.[3]

5- تەنگە نەفەسی (ضیق التنفس): لە دوو مانگی دوایی لە سک پڕی ڕوو دەدات، بەهۆی پاڵەپەستۆی منداڵدان لەسەر قەفەزەی سنگ وکەم کردنەوەی جوولانەوەی سیەکان.[4]

6- ڕەق بوونی ماسولکەکانی پشت وئازار: بە هۆی پاڵەپەستۆی سەری کۆرپەلە لەسەر دەمارەکانی حەوز وقاچ وران، زۆر جاریش بە هۆی کرژی لە ماسولکەکانی پشت وران دروست دەبێت (لە مانگی دوایی سک پڕی)، یان بەهۆی تێکچوونی هاوسەنگی ئافرەتەکە بێت لە کاتی وەستان، چونکە کاتی سک پڕی ئافرەت بۆ دواوە دەچەمێتەوە، ئەوەش وا دەکات ماسولکەکانی پشت وران بەردەوام کرژ بن و بەئازار بێت.[5]

---

1– Sheldon. *Complication of Pregnancy. P: 780.*
2– Sheldon. *Complication of Pregnancy. P: 495.*
3 – Sheldon. *Complication of Pregnancy. P: 818.*
4 – Sheldon. *Complication of Pregnancy. P: 430.*
5 – Sheldon. *Complication of Pregnancy. P: 999.*

## بەندی دووەم: نیشانە گشتیەکان

1- کۆ ئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي): ئەو کۆئەندامە تووشی پشێوی زۆر دەبێت، ئافرەت دەست دەکات بە ڕشانەوە بە تایبەتی بەیانیان ولە سێ مانگی یەکەمی سك پڕی. هەندێ لە ئافرەتانیش تووشی پشێوی لە هەرس کردن دەبن، ئارەزووی خواردنیان کەم دەبێتەوە، دڵە کزێ دەگرێ، ئەوانەش دەبنە هۆی کەم بوونەوەی کێش، بزر بوونی ئاو وشلە وکانزاکانی لەش.

لە دوای مانگی چوارەم باری کۆئەندامی هەرس باشتر دەبێت، بەڵام دوای گەورە بوونی منداڵدان وکۆرپەلە دووبارە بەهۆی پاڵەپەستۆوە پشێوی دەکەوێتەوە ناو کۆئەندامی هەرس.[1]

2- کۆئەندامی میزەڕۆ (الجهاز البولي): بە هۆی زیاد بوونی ڕۆیشتنی خوێن بۆ ناو گورچیلەکان بە ڕێژەی 60%، (Renal blood flow) زیاد بوونی پالاوتنی ناو پاوتگەکانی گورچیلە( Glomerulo filtration rate) بە ڕێژەی 50% دەرهاویشتنی پرۆتین زیاد دەکات.[2]

3- کۆئەندامی سوڕان (جهاز الدوران): لێدانی دڵ زیاد دەکات بە ڕێژەی 10-15%، پاڵنانی دڵ بۆ خوێن بە ڕێژەی 10% زیاد دەکات. لە کاتی ئاسایی دڵ ڕۆژی 5500-8000 لیترخوێن فڕێ دەدات بەڵام لە ئافرەتی سك پڕ دەگاتە 15000 لیتر.[3]

لە باری ئاسایدا منداڵدان تەنها 1.5% ئەو خوێنەی بۆ دەچێت کە دڵ فڕێی دەدات، بەڵام منداڵدانی سك پڕ نزیکەی 17% ی خوێنی دڵی بۆ دەچێت. واتە 12

---

*1 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 780-782.*

*2 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 551,502.*

*3 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 460-461.*

*- Stuart.Combell & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 49.*

- وأحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص84. والبار، محمد علي، خلق الإنسان، ص446.

جارانی خۆی خوێنی بۆ دەچێت، ئەوەش بۆ پێویستی کۆرپەلەیە کە بەردەوام لە گەشەیە، هەروەها پێویستی دایکەکەش خۆی. بۆ ئەو مەبەستەش دڵ خێراتر لێدەدات وزیاتر خوێن پاڵدەدات. هەر بۆیەش کاتی سک پڕی لەوانەیە دڵی ئافرەت قەبارەکەی هەندێك فراوانتر بێت.[1]

هەندێ ئافرەت تووشی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن دەبێت، بۆیە زۆر جار هەست بە سەرسووڕان دەکات. ئەو دابەزینە شتێکی سادەیە، بەڵام ئەوەی ترسناکە بەرز بوونەوەی پەستانی خوێنە، ئەگەر چارەسەر نەکرا ئەوا تووشی ژەهراوی بوون دەبێت(تسمم الحمل-الارتجاج الحملي- Eclampsia).

هەندێ جاریش ئافرەت تووشی کەم خوێنی دەبێت، چونکە کۆرپەلە بڕێکی باش لە کانزای پێویست دەبات لە خوێنی دایك، بەمەش ڕێژەی هیمۆگلوبین کەم دەبێت. بەرامبەر ئەوەش ژمارەی خڕۆکە سپیەکان وڕێژەی نیشتنی خڕۆکە سوورەکان (ESR) زیاد دەکات. ئافرەتی سك پڕ پێویستی بە 700-1150 میلیگرام لە ئاسن هەیە:250-350 میلیگرام بۆ کۆرپەلە، 400-650 میلیگرام بۆ خوێنی دایك، 50-150 میلیگرام بۆ خوێنی وێلاش. ڕۆژانە سك پڕ پێویستی بە 5-6 میلیگرام لە ئاسن هەیە.[2]

هەروەها پێویستی بە بڕێکی زیاد لە ترشی فولیك هەیە، لەکاتی ئاسایی پێویستی بە 50-100 مایکرو گرام هەیە، بەڵام لە کاتی سك پڕی پێویستی بە 150-400 مایکرو گرام هەیە.[3]

4- کۆئەندامی هەناسەدان: ئاوسانی گیرفانەکانی لووت وناو هاتنە خوارەوەی جارجارە، لە هەندێ ئافرەتیش بەردەوامە تاوەکو کۆتایی سك پڕیەکە بە تایبەتی لە مانگی کۆتایی. ئەوەش بە هۆی هۆرمونی سك پڕیە(پروجیسترۆن). هەروەها ئەو هۆرمونانە کار دەکەنە سەر ژێیەکانی دەنگ ودەنگی بۆ دەنگێکی گڕ دەگۆڕێ( بحة

---

1ـ أحمد كنعان ، موسوعة جسم الإنسان، ص56.

*2 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 842.*

*3 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 842.*

الصوت-جشة الصوت Hoarsnes)[1].

5- کۆئەندامی زاوزێ (الجهاز التناسلي): لە هەندێ ئافرەتدا بەهۆی ئاوسانی بۆڕییەکانی خوێنەوە شلەیەکی زەردباو بەدی دەکرێت، ڕەنگی ئەو ئەندامانەش کەمێك دەگۆڕێ بۆ وەنەوشەیی.[2]

6- مەمك (الثدي): قەبارەیان گەورە دەبێت، ئافرەت هەست دەکات کەوا مەمکەکانی پڕە، ئاوساون بە ئازارە کاتی دەست لێدانی. لەگەڵ بەرەو پێشەوە چوونی سك پڕی ڕەنگی جۆخینە بەرەو ڕەشی دەڕوات وبازنەکەی فراوانتر دەبێت، گلاندەکانی چەوریش تیایدا دەئاوسێت.[3]

7- پێستە (الجلد): هەندێ هێڵی ڕەنگدار پەیدا دەبێت لەسەر پێستەی ناوچەی ناوك وسك وگۆی مەمك پێی دەڵێن هێڵی سك پڕی (أثلام الحمل Striagravidarum)، لە زۆربەی زۆری90% ئافرەتان لە مانگی حەوتەم دەردەکەوێت ولە دوای یەك مانگ پاش منداڵبوون دەڕوات.[4] لە 70% ئافرەتی سك پڕ دیاردەی ڕەش بوونی نیمچە قاوەیی پێستە دیاردەکەوێت لەسەر ڕوومەت و نێوچەوان بە ناوی (إسوداد الجلد القتامیني Melasma-Mask pregnancy)، لەوانەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بمێنێتەوە بەتایبەتی گەر بەر ڕۆژ بکەوێت. هەروەها لەوانەیە ئافرەت تووشی خورانی پێستەی شوێنەواری یان گشتی بێت، لەگەڵ پچڕانی هەندێ بۆڕی خوێنی وورد لە ناوچە جیاکانی لەش.[5]

---

*1– Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 619–618.*

*2 – Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 1025.*

- فاخوري، موسوعة المرأة الطبية، ص108و أحمد كنعان موسوعة جسم الإنسان، ص38.

*3 – Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 505.*

*4 – Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 562.*

*- Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 1598.*

*5 – Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 562.*

8- چاو (العيون): دابەزینی پاڵەپەستۆی ناو چاو، بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی هۆرمونی ئیسترۆجین وپرۆجیسترون وئەندروجینی ناو خوێن، ئاوسانی قەرەنیەی چاو، لێڵ بوونی هاوێنەی چاو بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئیستروجین. ئەگەر ئافرەتەکە خۆی ئاوی سپی یان ئاوی ڕەشی هەبوو ئەوا کاتی سك پرشی زیاد دەکات.[1]

9- سك پڕ پێویستی بە ووزەی زیاتر هەیە، بە بڕی 300 کیلۆکالۆری/ یەك ڕۆژ، واتە پێویستی بە 85000 کیلۆکالۆری ووزەی زیاد هەیە لە ماوەی 280 ڕۆژی سك پڕی. هەروەها پێویستی بە پرۆتینی زیاد هەیە بە ڕێژەی 3.3 گرام، واتە 925 گرام زیاتری پێویستە لە ئافرەتی ئاسایی.[2]

10- دابەزینی بڕی هۆکارەکانی بەرگری(كريين الممنــع Immunoglobins) بەهەموو جۆرەکانیان (Ig.A و Ig.M بە تایبەتی Ig.G )، بەو هۆیەش بەرگری لەش کەم دەبێتەوە.[3]

11- زیاد بوونی کێشی دایك بە 10 - 13 کیلۆگرام. 5-8 کیلۆگرام بۆ کۆرپەلەو وێلاش وشلەی ئەمنیۆنی، ئەوی تریش بۆ کێشی دایك خۆیەتی.[4]

## بەندی سێیەم: نیشانەکانی دەرونی ودەماری

لەگەڵ ئەو نیشانانە جەستەیی وفسیۆلۆژیانەی باسمان کردن، دەبینین هەندێ نیشانەی دەرونی ودەماریش دیار دەکەوێت لە ئافرەتی سك پڕ. ئەویش لە نێوان ترس وپاڕانەوەیە، پەژارەو خۆشیە. ترس لە سك پڕی ونیشانەکانی، پاڕانەوە لە خواو خۆشی هاتنی نەوەیەکی نوێ یە. ئافرەت زوو هەڵدەچێت، بە بچوکترین هۆکار تووڕە دەبێت.

---

*1 — Kenneth. Principle & Practice of Endocrinology. P:1599.*

*2 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 49-51.*

*3— Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 387.*

4ـ أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص56. والبار، محمد علي، خلق الإنسان، ص448.

نیشانە دەرونیەكان كورت دەكەینەوە لەو خاڵانەی خوارەوە:

1- دڵ هەڵچوونی بەیانی ومەگیرانی (الوحـــام- morning sickness):
هەڵسوكەوتی ئافرەت دەگۆڕێ بەوەی ئارەزووی هەندێ شتی نا سروشتی دەكات، هەست بە ساردی وگەرمی، سەرسووڕەكی كەم دەكات، ڕقی لە بۆن دەبێتەوە.[1]

ئارەزووی زۆری بۆ هەندێ خواردن وشتی ناسروشتی دەچێت لە مانگەكانی سەرەتای سك پڕی، ئەوەش پێی دەڵێن: (الخمخمة أو الزرمزمـــة) ، هۆكارەكەشی دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی ئافرەت ئارەزووی دەچێتە ئەو ماددانەی كەوا لەشی پێویستیەتی وەك: ماددەی ئاسن وكالیسیوم بۆیە ئارەزووی دەچێتە خۆڵ وگەچ.[2]

2- خوراندن (الحكاك- Itching): ئارەزوویەكی زۆر دەكات بە خۆ خوراندن بە تایبەتی لە مانگەكانی دوایی و لە ناوچەی سك و ڕان وسمت. پزیشكان هۆكاری ئەو گۆڕانكاریە دەگەڕێننەوە بۆ گۆڕانی ئاستی هۆرمونەكان وكاری دەمارە خانەكان.[3]

3- بورانەوە (الإغمـــاء): هەندێ لە ئافرەتان تووشی سەرسووڕە دەبن لە مانگەكانی سەرەتای سك پڕشی، لەگەڵ بورانەوەیەكی سووك، بەهۆی گۆڕانی هاوسەنگی خوێن لە نێوان دایك وكۆرپەلەكەی.

4- سەر یەشان (أوجاع الرأس): لەسەرەتای سك پڕی دەست پێدەكات كە توندە، لە ناوەڕاست یان مانگەكانی كۆتایی كەم دەبێتەوەو دوایی دێت.[4]

5- خەوزڕان(الأرق): هەرچەندە ئافرەتی سك پڕ ئارەزووی خەوی هەیە، بەلام لە كۆتایی سك پڕی تووشی خەوزڕان دەبێت، بە هۆی نا دروستی هەرس، تەنگە نەفەسی، كرژبوونەوەی ماسولكەكان، جوولانەوە نارێكەكانی كۆرپەلەی ناو سكی، ترسی منداڵبوون ونیشانە پەیوەستەكانی.[5]

---

1 ــ فاخوري، موسوعة المرأة الطبية، ص108.

2 ــ فاخوري، موسوعة للمرأة الطبية، ص108 .

*3 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 567, 821.*

*4 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 1011.*

*5 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 1011.*

هەر لەبەر ئەو نیشانانەی باسمان کرد خوای گەورە کاتێ باسی سك پڕی دەکات بە بار گرانی وقورسی و نارەحەتی ناوی دەبات، هەر بۆیەش فەرمانی داوە بە ڕێز گرتنی دایك، هێناویەتیە ئاستی خوا پەرستی وهاوبەشی پەیدا نەکردن بۆی، نابێت بەرامبەریان ڕوو گرژ بین، تەنها نابێت ووشەی (ئۆف) بەرامبەری بەکار بهێنرێ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَـٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ ﴾ الأحقاف: 15

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ ﴾ لقمان: 14

هەر لەبەر ئەو هۆیانەشە ئافرەت پێویستی بە چاودێریەکی تەواوو دروست و باش هەیە لەلایەن دەوروبەری بەتایبەتی هاوسەرو منداڵەکانی.

بەڵام دەبینین لە دەستوورەکانی ماددی زۆر پێیان ڕەوایە کە ئافرەتان کار بکەن وبژێوی خۆیان پەیدا بکەن، جا هەر چ کارێك بێت، هەرچەندە نادروست ونا پەسەند وقورس بێت، بەبێ ڕەچاوکردنی باری تەندروستی وجەستەیی ودەرونی. هەر ئەو هیلاکی وماندوو بوونەی بۆئافرەتیان ڕەوا کردووە بە ئازادی وسەربەستی و مافی ئافرەت ناوی دەبەن. لێرەوە داواکارم کە ئافرەتانی تێگەیشتوو چاویان بکەنەوەو دۆست ودوژمنی خۆیان بناسن، بزانن کێ وکام بەرنامە ئاسوودەیی و خۆشی وسەربەرزی ئەوانی دەوێت، بەرنامەو مەنهەجی دروست ونا دروست لێك جیا بکەنەوەو سوودو قازانجی خۆیان بزانن لە کوێ یە، بە ڕێکلام و هێمای بریقەدارو ڕەنگاو ڕەنگ هەڵنەخەڵەتێن. بزانن کام کار بۆیان گونجاوە ودەتوانن ڕەزامەندی خوای تیادا بەدی بکەن ومەرجەکانی شەرعیش ڕەچاو بکەن لە کاتی چوونە دەرەوەو کارکردن. (بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی کاری گونجاو بۆئافرەت ومەرجەکانی چوونە دەرەوە بۆ کارکردن، بگەڕێوە کتێبی دانەر پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان).

# باسی سێیەم

# پاشکۆکانی سك پڕی

# ( ملحقات الحمل )

بەندی یەکەم : شلەی ئەمنیۆنی

بەندی دووەم : پەتی ناووك

بەندی سێیەم : وێلاش

## باسی سێیەم: پاشکۆکانی سك پڕ

پێش کۆتایی هێنانی باسی سك پڕی، ویستم بەکورتی باسی پاشکۆکانی سك پڕی بکەم بۆ زیاتر شارەزا بوونی خوشکان وبرایانی بەڕێزم.

### بەندی یەکەم: شلەی ئەمنیۆنی (السائل الأمنيوني - Amniotic fluid)

ئەو شلەیەی کە دەوری کۆرپەلەی داوە لە کاتی سك پڕی، ئەویش ئەرك و فەرمانی زۆری هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن: پارێزگاری کۆرپەلە لە پاڵەپەستۆکانی دەرەکی، قەدەغە کردنی پێکەوە لکانی ئەندامەکانی کۆرپەلە، پارێزگاری وکۆنترۆلی پلەی گەرمی لەشی کۆرپەلە، ئاسان کردنی کرداری منداڵبوون.[1]

قەبارەی شلەی ئەمنیۆنی چەسپاو نیە لە ماوەی سك پڕی، لە سەرەتای هەفتەی دەیەم تەنها 30 میلیلترە، دەگاتە قەبارەی 1000 میلیلتر لە هەفتەی 38ی سك پڕشی. دوایی بەرەو دابەزین دەڕوات دەگاتە 350 میلیلتر لە کۆتایی ڕۆژەکانی سك پڕی.[2]

### بەندی دووەم: پەتی ناووك (الحبل السري- Ambilical cord)

ئەو پەتەیە کە کۆرپەلە بە وێلاش دەبەستێتەوە. هەر ئەویشە خۆراك وئۆکسجین بۆ کۆرپەلە دابین دەکات بەهۆی سوڕی خوێنی دایك. هەرچەندە سووڕی خوێنی دایك لەگەڵ خوێنی کۆرپەلە تێکەڵاو نیە ڕاستەوخۆ، بەڵکو پەردەیەکی زۆر تەنکی هەستیار هەیە لە نێوانیان کە ڕێگەی شتە باشەکان دەدات و ڕێگەی شتە خراپەکان نادات بچنە ناو لەشی کۆرپەلە. درێژی ئەو پەتە 50 سم، تیرەکەشی 1.5-2.5 سم دەبێت، دوو خوێن بەرو یەك خوێن هێنەری تیایە. خوێن هێنەرەکە خۆراك و

---

*1 _ Stuart.Combell & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 66.*

2 _ أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص59.

*-.Stuart.Combellm Obstetric by ten teachers. P: 45*

*-861John.W.Hole, JR. Anatomy&Physiology. P:*

---

ئۆكسجین دەبات بۆ كۆرپەلە، خوێن بەرەكانیش خوێنی پیس بوو بە دووەم ئۆكسیدی كاربۆن دەبەنەوە بۆ سیەكانی دایك بۆ دەرهاویشتنی.[1]

## بەندی سێیەم: وێلاش (المشیمە- Placenta)

پێكهاتووە لە دوو گۆی بەرامبەر بەیەكی پێكەوە نووساو، دایك وكۆرپەلە بەشدارن لە دروست كردنی، تیرەكەشی لە نێوان 15-20 سم، ئەستووری 3 سم، كێشەكەی 500 گرام.

ڕوكەشی وێلاش كە بەستراوە بە كۆرپەلە پەردەیەكی ناسك ولووسە، بۆری خوێنی تیا دیارە، لە ناوەڕاستیشی پەتی ناووك بەستراوە، یان بەیەكێك لە لایەكانیەوە.

بەلام ئەو لایەنەی بەستراوە بە منداڵدان زبرەو لە 15-20 بەش پێكهاتووە. لە نێوان بەشی منداڵدان وبەشی كۆرپەلە پەردەیەك هەیە پێی دەڵێن (پەردەی وێلاش) سووری خوێنی دایك وكۆرپەلە جیا دەكاتەوە كە ڕێگەی شتە باشەكان دەدات و ڕێگەی شتە خراپەكان نادات بچنە ناو لەشی كۆرپەلە وەك بەكتریاو نەخۆشیەكان (مەگەر بە دەگمەن نەبێ).

ئەرك وفەرمانەكانی وێلاش: ئۆكسجین دەبات بۆ كۆرپەلە، خوێنی پیس بوو بە دووەم ئۆكسیدی كاربۆنیش بۆ ناو خوێنی دایك دەبات بۆ دەرهاویشتن. خۆراكی هەرس كراو بۆ كۆرپەلە دەبات بە بڕو ڕێژە وكاتی دیاری كراو، هەروەها ئالوگۆڕ

---

*1 — John.Hole JR. Human Anatomy&Physiology. P: 861.*

2 ــ مفید حنون، أساسیات علم وظائف الأعضاء، ص306. وللبار، خلق الإنسان، ص427-430.

*-Stuart.Combell &Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 157.*

*- Leslie.J.Degroot . Endocrinology. P: 2043/3.*

# باسی چوارەم

# حوکمەکانی ئافرەتی سک پڕ

# (أحكام المرأة الحامل)

بەندی یەکەم: ڕۆژو گرتن

بەندی دووەم: حەددەکان وسک پڕی

بەندی سێیەم: پاداشتی ئافرەتی سک پڕ

## باسی چوارەم: حوکمەکانی ئافرەتی سك پڕ

سك پڕی حوکمی تایبەتی خۆی هەیە، دەتوانین بڵێین ئەو حوکمانە بە حوکمی هەڵاوێردراو(الاستثناء)دادەنرێ. چونکە ئافرەت لەو ماوەیەدا کە 6-9 مانگە باری تەندروستی وجەستەیی ودەرونی لاسەنگیەکی تیایە، دەتوانین بڵێین لەنێوان ساغی ونەخۆشیدایە،لەوانەیە بەبچوکترین هۆکار تووشی نەخۆشیەکی تەواوی جەستەیی یان دەرونی بێت، هەر بۆیە ڕەوا نیە بەهیچ شێوەیەك ئافرەت بیخەیتە ناو کارێکی قورس و کێشەیەکی دەرونی بەتایبەتی لەمانگەکانی دوایی، هەر ئەو هۆیانەشە وای کردووە لە هەندێ زانایان کە ئافرەت دوور بگرن لەپۆستەکانی باڵای وڵات، چونکە کێشەو ململانێی زۆری تیایەو باری ئافرەت لەو ماوەیەدا بەرگەی ئەو کارانە ناگرێت (بۆهەموو یاسایەکیش شتی نامۆو دەگمەن هەیە). بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی کاری ئافرەت بڕوانە کتێبی(پیاوان وژنان تەواوکاری نا یەکسان) دانەر.

### بەندی یەکەم: ڕۆژو گرتن

خوای گەورە بۆ ئافرەتی سك پڕ، گەر کەوتە ماندوو بوون وبەرگە نەگرتن ڕێگەی داوە بە ڕۆژو نەبێ، بەمەرجێ دوای منداڵبوون و پاکبوونەوەو گەڕانەوەی هێزو توانا بیگێڕێتەوە، چونکە ئافرەت لەو کاتەدا پێویستی بە دابین کردنی خۆراك هەیە بۆ خۆی و بۆ کۆرپەلە، ئەو بارانەی کە ئافرەتی سك پڕ ڕێگەی پێدراوە ئەمانەن:[1]

ئافرەتی سك پڕو شیردەری منداڵەکەی گەر لە گیانی خۆی وکۆرپەلەی ترسا توشی زیان بێت ئەوا ڕۆژو ناگرێت، بەلام دوایی ڕۆژوەکە دەگێڕێتەوەو فدیەی لەسەر نیە. ئەگەر تەنها لە گیانی کۆرپەلەو منداڵەکەی ترسا ئەوا ڕۆژوەکەی دەگرێتەوەو فدیەش دەبێ بدات.

---

1ـ ابن قدامة، المغني،139/3. والنووي، سراج الوهاج، ص143، والنـووي، المجمـوع، 293/6. المرغيناني، علي بن أبي بكر، الهداية شرح بداية المبتدي. و ابن الهمام، محمـد بـن عبد الواحد السيواسي، فتح القدير على الهداية شرح بداية المبتدى للمرغيناني، ومعه شرح العناية للبابرتي، وحاشية سعدي لفندي، مع تكملته لمؤلفها القاضي زادة شمس الدين ، نتائج الأفكار في كشف الرموز والأسرار، 82/2.

لە مەزهەبی مالیکی هاتووە: کە فدیە لەسەر ئافرەتی شیردەرە نەوەك لەسەر ئافرەتی سك پڕ..[1]

ئیبن قودامەی حەنبەلی[2] دەڵێ: ڕۆژو گرتنەوەو فدیە لەسەر ئەو ئافرەتانە هەیە کە لە ترسی کۆرپەلەو منداڵە شیرەخۆرەکەی ڕۆژو ناگرێت.[3] بەبەڵگەی ئەو ئایەتە:﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ البقرة: 184.

## بەندی دووەم: سنوورەکان وسك پڕی (الحدود والحمل).

دواکەوتنی جێبەجێ کردنی سنوورەکانی خوای گەورە لەسەر ئافرەتی سك پڕ تاوەکو دوای منداڵبوون وپاکبوونەوەی لە زەیستانی، وەك ڕەحمەتێك بۆ ئافرەت و منداڵەکەی.

لە عیمرانی کوڕی حەصینﷺ دەگێڕنەوە ودەڵێ: ((ئافرەتێکی تیرەی جەهینە کە سکی پڕ بوو پاش کاری زینا کردن، هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ ،ووتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پاکم بکەوە و حەددم لێ دەربکە تاوانم کردووە. پێغەمبەری خواﷺ بانگی وەلی ئافرەتەکەی کردوو فەرمووی: لەگە ڵی باش بە، دوای دانانی سکەکەی وەرەونەوە لامان، کاتێ هاتنەوە، حەددی لەسەر دەرکراو نوێژی لەسەر کرد)).[4]

---

1 ــ الصاوي، حاشية الصاوي،253/1. والحنبلي، مرعي بن يوسف، غاية المنتهى في الجمع بين الإقناع والمنتهى، والإقناع مؤلفه موسى بن أحمد موسى الحجاوي المقدسي. وأما مؤلف المنتهى فهو ابن النجار، محمد بن عبد العزيز القنوجي المصري، 325/1.

2 ــ ابن قدامة:عبد الله بن أحمد المقدسي: ئیمامی زاهیدەکان بووە، یەکێکە لە هەرە زانا بەرزەکانی مەزهەبی حەنبەلی، هاتووتە عێراق و لە شام کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی 620 ك. کتێبی زۆری داناوە. سير أعلام النبلاء، 165/22.

3 ــ ابن قدامة، المغني، 139/3.

4ــ الجارودي، عبد الله بن علي النيسابوري ، المنتقى لابن الجارودي. الرقم:815 ،207/1. وناصف، منصور علي، التاج الجامع للأصول. كتاب الحدود: باب: لا يقام الحد على النفساء حتى تصح ومن الحامل حتى تضع، 27/3. رواه خمسة.

ئافرەتی سك پڕ حەددی لەسەر دەرناکرێ، چ حەددی جەڵدە بێ یان بەرد باران (الرجم) بێت، سك پڕیەکە لە زینا بێت یان لە نیکاحی ئاسایی بێت. ئیبن قودامە دەڵێت: لەو بارەیەو خیلاف نیە لە نێوان زانایان.[1]

حیکمەتی ئەو دواخستنە ئەوەیە: چونکە کۆرپەلە نەفسێکی ئازادو بێ تاوانە، لەوانەیە لەکاتی دەرکردنی حەددەکە بمرێ، بۆیە دوا دەخرێت.

ئەوەیە مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا، کۆرپەلەیەکی بێ گاو هۆش مافی پارێزراوە هێشتا هەر لە سکی دایکیەتی، مافەکانی خوای گەورە دوا دەخرێت لەبەر خاترو رێزو گەورەیی ئەو بوونەوەرە بچکۆلەیە کە هێشتا روحی نەهاتووتە بەر.

## بەندی سێیەم: پاداشتی ئافرەتی سك پڕ

ئیبن عومەرﷺ دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواﷺ کە فەرموویەتی: ((ئافرەت لە کاتی سك پڕی تاوەکو منداڵبوونی و شیردانی پاداشی هەیە وەك کەسێکە کە لە رێگەی خوا کار دەکات، ئەگەر لەو ماوەیەشدا تیا چوو ئەوە پلەی شەهیدی هەیە)) ((إن للمرأة في حملها إلى وضعها، إلى فصالها من الأجر، كالمتشحط في سبيل الله، فإن هلكت فيما بين ذلك، فلها أجر شهيد)). وفي رواية أخرى: ((كالمرابط في سبيل الله)).[2]

---

1 ــ ابن قدامة، المغني، 171/8. والهداية وفتح القدير، 137/4. والنووي، المجموع، 275/18.

2ــ الجوزي، عبد الرحمن بن علي، أحكام النساء، ص352 . والعسقلاني، ابن حجر، لمطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية، الرقم: 1720 ،84/2. والهيثمي، نور الدين ت:807هـ، مجمع الزوائد، 305/4.

# بەشی سێیەم

## بەربەستکاری- ڕێگرتن لە سك پڕی- دیاری کردنی نەوەکان

## ( العزل - منع الحمل- تنظيم الأسرة - تحديد النسل )

## ( Contraception –Family planning -Fertility control )

باسی یەکەم : واتای بەربەستکاری وسیفەتەکان

باسی دووەم : جۆرەکانی بەربەستکاری و کاریگەرە لاوەکیەکانی

باسی سێیەم : حوکمی بەربەستکاری لە شەریعەتی ئیسلام

# باسی یەکەم

# واتای بەربەستکاری و سیفەتەکان

**بەندی یەکەم : واتای بەربەستکاری و سیفەتەکان**

**بەندی دووەم : سیفەتەکانی بەربەستی سەرکەوتوو**

## باسی یەکەم: واتای بەربەستکاری وسیفەتەکان

### بەندی یەکەم: واتاکەی

واتای زمانی: (عزل الشيء يعزِلُهُ عَزْلاً وعَزَّله وانْعَزَلَ وتَعَزَّلَ. نحاه جانباً فتنحى، تنحى عنه: بەلای وەنا، بۆ لایەکی لادا، خۆی لێ لادا. وعزل عن المرأة: لم يُرِدْ ولدها، بەربەستکاری کرد لەگەڵ ئافرەتەکە: واتە منداڵی نەویست لەو ئافرەتە. پیاوەکە ئاوی خۆی لە کەنیزەکە لابدات، تاوەکو سکی پڕ نەبێت.[1]

واتای زاراوەیی: لادانی ئاوی پیاو لە ئافرەتەکەی لە ترسی سك پڕی.[2]

بەربەست: ڕژاندنی ئاوی ئارەزوو (شهوە) لە دەرەوەی زێ.[3]

### بەندی دووەم: سیفەتەکانی بەربەستکاری سەرکەوتوو (مواصفات العزل وطرق منع الحمل).

بەربەستی سەرکەوتوو پێویستە ئەو سیفەتانەی تیابێ.

1- کاریگەریەکی بەرزی هەبێت.

2- کاریگەریە لاوەکیەکانی کەم بێت.

3- کارنەکاتە سەر کرداری جووتبوون.

4- بە ئاسانی دەست بکەوێت.

5- پاش بەکار نەهێنانی، نە بێتە بەربەست لەبەردەم گەڕانەوەی کرداری زاوزێ سەر لە نوێ.

6- نرخی هەرزان بێت.

---

1 ــ ابن منظور، لسان العرب، 190/9. ابن الأثير، النهاية في غريب الحديث والأثر، 230/3.

2 ــ الجرجاني، التعريفات، ص86.

3 ــ العسقلاني، ابن حجر، الفتح الباري، 305/9.

7- لە هەموو شەریعەکانی ئاسمانی ڕێگە پێدراو بێت.

8- بەئاسانی دابەش بکرێت.

9- باشترە چاودێری پزیشك و چاودێری تەندروستی پێویست نەبێت.

بۆ گەیشتنە ئەنجامی دروست و سەرکەوتنی بەربەستکاری، زۆر جار پزیشکەکان دوو ڕێگە، یان دوو هۆکار بەیەکەوە بەکار دەهێنن.

سەرکەوتنی ئەو کارە دەوەستێت لەسەر چۆنیەتی دەست نیشان کردنی ڕێگەی بەربەستکاری، گونجانی بۆ جەستەی بەکارهێنەر(ئادەمیزاد)ەکە، شارەزایی پزیشکەکە لە دانان یان بەکارهێنانی هۆکارەکە، بەڵام زۆربەی سەرنەکەوتن بەهۆی نەزانینی بەکارهێنانە لەلایەن بەکارهێنەرەوە.[1]

*1 – Stuart & Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 65.*
*-James R.Scott et al. Danforths Obstetric & Gynecology. P: 571-576.*

# باسی دووەم

## جۆرەکانی بەربەستکاری و کاریگەرە لاوەکیەکانی

## ( أنواع العزل- وسائل العزل- طرق العزل ومضاعفاتهم )

بەندی یەکەم: بەکارهێنانی هۆرمونەکان

برگەی یەکەم: هۆرمۆن لەسەر شێوەی دەنك (حەب)

برگەی دووەم: دەرزی هۆرمونەکان

برگەی سێیەم: دانانی دەزگایەك لە ناو منداڵدان بەندی دووەم

بەندی دووەم: بەکارهێنانی بەربەست

برگەی یەکەم: بەربەست بۆ پیاوان

برگەی دووەم: بەربەست بۆ ئافرەت

بەندی سێیەم: ڕێکخستنی سروشتی خێزان

برگەی یەکەم: بەکارهێنانی ڕۆژ ژمێر

برگەی دووەم: شیرپێدانی سروشتی

برگەی سێیەم: دەرهاویشتنی ئاو لە دەرەوەی زێ

بەندی چوارەم: نەزۆك کردن - خەساندن

برگەی یەکەم: نەزۆك کردنی پیاو

برگەی دووەم: نەزۆك کردنی ئافرەت

**باسی دووەم: جۆرەکانی بەربەست و کاریگەرە لاوەکیـەکانی- ماکە خراپەکانی (أنواع العزل وطرق منع الحمل ومضاعفاته).**

بە شێوەیەکی گشتی چ ئافرەت چ پیاو یەکێك یان زیاتر لە ڕێگەکان، هوکارەکانی بەربەست بەکار دەهێنێ لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا، لەبەر پاساوی خێزانی، ئابووری، کۆمەلآیەتی.

## بەندی یەکەم: بەکارهێنانی هۆرمونەکان

### بڕگەی یەکەم: هۆرمۆن لەسەر شێوەی دەنك (حەب):

**یەکەم: تێکەڵەی هۆرمونی پرۆجیسترۆن ونیسترۆجین**

(Combined Estrogen & Progesteron Pills-CCP)

بەکاردەهێنرێ بەبڵاوی، بە تایبەتی لەلایەن ئەوانـەی لـەش سـاغن ولەسـەرەتای ژیانی هاوسـەریدان. بـەکارهێنانی ئاسـانە، کـە ئافرەتەکـە ڕۆژێ یـەك دەنـك حـەب دەخوات بۆ ماوەی 21 ڕۆژ، دوای ئەوە 7 ڕۆژ دەیوەستێنێ.

چۆنیەتی کار کردنی ئەو ڕێگەیە (میکانیزمی کارکردنی):

1- قەدەغەی پێگەیاندنی هێلکە دەکات لە هێلکەدان.

2- پوکاندنەوەی چینی ناوەوەی دیواری منداڵدان.

3- قەدەغەی هەڵواسینی هێلکەی پیتێنراو دەکات بە دیواری منداڵدانەوە.

4- چڕی ماددە لینجەو چڵمیەکانی ملی منداڵدان زیاد دەکات تاوەکو سپێرم نەتوانێ سەربکەوێت بۆ ناو منداڵدان.[1]

---

*1 — Stuart.Combel l&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P : 67.*
*- James R.Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 556.*
*- LeanSperoff et al . Aclinical Guide for contraception. P: 21.*

قەدەغە کردنی بەکارهێنانی ئەو هۆرمونانە: دوو جۆر قەدەغە کردنی هەیە: (مضادات الاستطباب- Contra indication):[1]

**ا- قەدەغە کردنی تەواوی یەکجاری (المطلق)**

1- بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەسك بوونەوەی خوێنبەرەکانی دڵ، گیرانی بۆریەکانی دڵ، خوێن بەربوونی بۆماوەیی یان وەرگیراو.

2- نەخۆشیە کورت خایەنەکان وتوندەکانی جگەر(الحاد).

3- شێرپەنجەی مەمك.

4- شەقە سەر (داء الشقیقة النوع البؤري).

**ب- قەدەغە کردنی رێژەیی (النسبي).**

1- لەتە سەریەشان (داء الشقیقة النوع العام).

2- خوێن هاتن لە منداڵدان بە شێوەی نارێك(خوێن بینینی نارێك).

3- نەجوولانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر.

4- نەخۆشی شەکرەو قەڵەوی.

5- ئافرەتی جگەرە کێشی تەمەنی لە 35 بەسەرەوە.

6- نەخۆشیە تازەکانی جگەرو کیسەی زەرداو.

7- شیرپێدانی منداڵی بچوکتر لە 6 مانگ.

**لایەنە باشەکانی (پۆزەتیڤەکانی):**

1- لە هەموو رێگەکانی تری بەربەست بڵاو ترەو ناسراوتر وئاسانترە.

2- کار لە کرداری جووتبوون ناکات.

3- وا دەکات خوێنی بێ نوێژی کەم ئازار، بڕی کەم، رێك بێت.

---

*1 — Stuart.Combel l&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 67.*
*- James R.Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 556.*
*- LeanSperoff et al . Aclinical Guide for contraception. P: 21.*

4- ئەگەری شێرپەنجەی هێلکەدان، کۆلۆن، منداڵدان کەم دەکاتەوە.

5- هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ کەم دەکاتەوە.

6- ئەگەری تووش بوون بە نەخۆشی کیسەی هێلکەدان( Ovarian cyst) ،سك پڕی دەرەوەی منداڵدان(Ectopic pregnancy)، شێرپەنجەی ریشاڵی(Fibroid) کەم دەکاتەوە.

7- لە هەموو تەمەنەکان بەکاردێت.

8- رێژەی کاریگەر وسەرکەوتنی بەربەستکردنی بەرزە دەگاتە 99.9٪.

**لایەنە نیگەتیڤەکانی (ماکە خراپەکانی):** [1]

أ- ناوەندە کۆئەندامی دەمار: خەمۆکی، سەریەشە، کەم بوونەوەی ئارەزووی خواردن، دەنکۆڵەی گەنجیەتی (حب الشباب)، زیاد بوونی کێشی لەش وپف بوونی دەم وچاو.

ب- کۆئەندامی هەرس:دڵ هەڵچوون،ڕشانەوە،زەردوویی(اليرقان-اصفرار الدم).

ج- کۆئەندامی میزەڕێ: هەوکردنی میزەڵدان، شێواندنی سووڕێ مانگانە، تووش بوون بە نەخۆشی توورەکەی هێلکەدان، گەشەی شێرپەنجەی ریشاڵی هێلکەدان ومنداڵدان .

د- مەمك: ئازاری مەمك بەتایبەتی کاتی گوشین، ئەگەری تووش بوون بە شێرپەنجەی مەمك بەتایبەتی لەوانە لە 40 ساڵ بەسەرەوەن.

هـ- کاریگەری لاوەکی تر، وەك: زیاد بوونی پارچەی قاوەیی لەسەر دەم وچاو (Cloasma)، ئازاری قاچ کاتی ڕۆیشتن، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن وگیرانی بۆریەکانی خوێنی دڵ لەو کەسانەی جگەرە دەکێشن.

---

*1 — Stuart&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 68 -70.*

*- James R.Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 558-556.*

**دووەم: حەبی پرۆجیسترۆن بەتەنها (Progestron Only Pill- POP)**

هەمان میکانیزمی کارکردنی (CCP)هەیە.

باشتر وایە ئەو حەبە بەکار نەهێنرێ لەو بارانەی خوارەوە:

1- سك پڕی.
2- شێرپەنجەی مەمك.
3- نەخۆشیەکانی دڵ.
4- نەخۆشیە کورت خایەنەکان وتوندەکانی جگەر.
5- هاتنەخوارەوەی خوێن لە داوێن ( کە نازانرێ هۆی چیە).
6- بوونی نەخۆشی تورەکەی هێلکەدان لەناو خێزانەکەیان.
7- شیرپێدانی منداڵی بچوکتر لە 6 مانگ.

**لایەنە باشەکانی:**

1- ڕێژەی کاریگەر وسەرکەوتنی بەربەستکردنی بەرزە دەگاتە 99.5٪.
2- لە هەموو تەمەنێك بەکار دێت، هەرچەندە لە 35 ساڵ بەسەرەوە بێ و جگەرە بکێشێت.
3- ئەگەری شێرپەنجەی هێلکەدان، منداڵدان کەم دەکاتەوە.
4- هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ کەم دەکاتەوە.
5- ئازارو نارەحەتی بێ نوێژی نیە.
6- دەتوانرێ لە کاتی شیرپێدانی منداڵ بەکار بهێنرێ.

**لایەنە خراپەکانی:**

1- هەندێ جار کرداری بێ نوێژی ناڕێك دەکات، یان وون دەبێت.
2- دەبێت حەبەکە هەموو ڕۆژێ لەیەك کاتدا وەربگرێ.
3- قەڵەوی دەکات (البدانة- السمنة).
4- مەمکی توند وبەئازار دەکات.
5- ئەگەری تووش بوون تورەکەی هێلکەدان وشێرپەنجەی مەمك وزێ زیاد دەکات.

6- سك پڕی لە دەرەوەی منداڵدان.

7- سەریەشە.

## بڕگەی دووەم: دەرزی هۆرمۆنەکان ( حقنة الهرمونات ). [1]

یەکەم: دەرزی پرۆجیسترۆن کە لە ماسولکەی ڕان (سمت) دەدرێت.
( Depo provera بالعضلة- I.M)

نا بێت ئەو ڕێگایە بەکار بهێنرێ لەو بارانەی خوارەوە:

1- سك پڕی.

2- شێرپەنجەی مەمك.

3- نەخۆشیەکانی دڵ.

4- نەخۆشیە کورت خایەنەکان وتوندەکانی جگەر.

5- هاتنەخوارەوەی خوێن لە دامێن ( کە نازانرێ هۆی چیە).

6- نەخۆشی داخوڕانی ئێسقان(تنخر العظام- Osteoporosis).

7- نەخۆشی شەکرە.

8- بەرزی پەستانی خوێن وگیرانی بۆڕیەکانی خوێن (Thrombosis).

**لایەنە باشەکانی:**

1- ڕێژەی کاریگەر وسەرکەوتنی بەربەستکردنی بەرزە دەگاتە 99.7٪.

2- لە هەموو تەمەنێك بەکار دێت.

3- ئەگەری شێرپەنجەی هێلکەدان، منداڵدان، سك پڕی لە دەرەوەی منداڵدان، هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ کەم دەکاتەوە.

4- ئازارو نارەحەتی بێ نوێژی نیە.

5- دەتوانرێ 6 هەفتە دوای منداڵبوون بەکار بهێنرێ.

---

*1 _ Lean Speroff et al. Aclinical Guide for contraception. P: 153,199.*
*- Stuart &Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 70.*

**لایەنە خراپەکانی:**

1- هەندێ جار کرداری بێ نوێژی نارێك دەکات، یان وون دەبێت.
2 - کێشی لەش زیاد دەکات (زيادة الوزن).
3- مەمکی توند وبەئازار دەکات، کەمکردنەوەی بڕی شیری دایك.
4- سەریەشە و سەر سوڕان وسك یەشەی هەیە.
5- خاوی لەگەڕانەوەی کرداری زاوزێ(ماوەی گەڕانەوە بۆمنداڵبوون دوورو درێژە).
6- داخوڕانی ئێسقانەکان.
7- لێدانی دەرزیەکە یەکێکی شارەزای پێویستە.

دووەم: دانـــانی پارچـــەیەك لـــە کـــانزای تـــەنك وباریـــك لـــە ژێـــر پێستە(Contraceptive implant method- Norblant capsule)، کـە هۆرمـونی پرۆجیسـترون بـە شـێوەیەکی لەسـەر خـۆ دەرژێنێتـە نـاو خـوێن. زۆر کاریگەرەو شیری دایك کەم ناکاتەوە، لەلایەن ئەوئافرەتانە بەکار دێت کە ناتوانن بەرگەی ماکە خراپەکانی حەبی تێکەڵاو بگرن.

**لایەنە خراپەکانی:**

1- نرخی گرانە.
2- بۆ ماوەی پێنج ساڵ کاردەکات (گەر هەردوو هاوسەر پەشیمان بوونەوە لە بڕیاری بەربەست، ئەوا دەبێت تاوەکو پێنج ساڵ چاوەڕوان بن).
3- هێنانە دەرەوەی چاودێری پزیشکی پسپۆڕی دەوێت.

**بڕگەی سێیەم: دانانی دەزگایەك لە ناو منداڵـدان** (Intra Uterine Device-IDU)

ئـەو دەزگایـە لـە کـانزای مـس(Copper) دروسـت کـراوە، لەلایـەن پزیـشکی ئافرەتانەوە دادەنرێت. باوترین جۆری بریتیە لە (T- Copper 380).[1]

---

*1: 221 – Lean Speroff. Aclinical Guide for contraception. P*
*- Stuart.Combell&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 71.*

**چۆنیەتی کارکردنی:**

1- قەدەغەی هەڵواسراوە دەکات.
2- سپێرمەکان ژەهراوی دەکات.
3- کاریگەری لەسەر چینی ناوەوەی وماسولکەکانی منداڵدان دەکات.

**لایەنە باشەکانی ئەو رێگایە:**

1- بەربەستە لەبەردەم سك پڕی بۆ ماوەی 3-5 ساڵ.
2- ڕاستەوخۆ دوای دانانی کاریگەری دەست پێدەکات.
3- ڕێژەی کاریگەری بەرزە دەگاتە 99.4٪.
4- کاریگەری لەسەر کرداری جووتبووندا نیە.
5- کرداری دانان ولابردنی زۆر ئاسانە.
6- هیچ نا ڕەحەتیەکیەکی بۆ ئافرەتەکە نیە.
7- هەرکات دەرهێنرا ئەوا ئافرەت دەتوانێ زاوزێ بکات.
8- پەیوەندی نیە بە وەرگرتنی دەرمان لەلایەن ئافرەتەوە.
9- شیری دایك کەم ناکاتەوە.

**لایەنە خراپەکانی:**

1- زیاد بوونی بڕی خوێنی بێ نوێژی وئازار وماوەکەی.
2- ئەگەری هاتنە دەرەوەی دەزگاکە.
3- ئازارو خوێن هاتن بە هۆی دانانی.
4- کون بوونی منداڵدان.
5- ناتوانێ بەرگری لە نەخۆشیە جینسیە گوازراوەکانی(STD) بکات.
6- لەوانەیە دوچاری هەوکردن بێت پاش چەند هەفتەیەك لەدانانی دەزگاکە.[1]

- *James R.Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 56.*
1 – *Stuart.Combell & Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 71-72.*

**قەدەغە کردنی بەکارهێنانی:**

1- هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ.
2- بوونی نەخۆشیە جینسیە گوازراوەکان.
3- بوونی شێرپەنجە لە کۆئەندامی زاوزێ.
4- ئافرەتی خوێندار، یان ئەو ئافرەتانەی کە تاوەکو ئێستا منداڵیان نەبووە(Nilliparae).
5- بوونی شێواوی بۆماوەیی لە منداڵدان (تشوه خلقي في الرحم).
6- هەستیاری(حساسية) ئافرەت بۆ کانزاکە.

جۆرێکی نوێ لەو دەزگایانە هەیە کە هۆرمونی پرۆجیسترۆنی تیایە (52 میلیگرام)، کە ڕۆژانە20 مایکرۆگرام دەداتە منداڵدان( Levonorgestrel releasing IUD- Mirena)، ئەمەش وا دەکات کە خوێنی بێ نوێژی کەم بکاتەوە. [1]

**بەندی دووەم: بەکارهێنانی بەربەست(العازل-الوقاء- Barrior methods) 2**

**بڕگەی یەکەم: بەربەست بۆ پیاوان (الوقاء للرجال- العازل - Condom)**

بریتیە لە تورەکەیەك دروست کراوە لە ماددەیەکی لاستیکی( Latex, Polyurethrane)، لە ناویدا ماددەیەکی ژەهراوی هەیە بۆ کوشتنی سپێرمەکان. ئەو جۆرە پلاستیکە گۆڕانی پلەی گەرماو شێ کاری زۆر تێ ناکات بۆ لەناوچوون یان تێکچوونی.

---

*1 – Edmonds K. Dewhurts text book of obstetrics. P:306*
*2– Lean Speroff. Aclinical Guide for contraception. P: 259.*
*- Stuart.Combell& Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 72.*

**لایەنە باشەکانی ئەو ڕێگایە:**

1- ڕێـژەی کاریگـەری و سـەرکەوتنی دەگاتـە 86٪، گـەر بـاش بـەکار بهێنـرێ دەگاتە 97٪.

2- نرخی زۆر هەرزانە.

3- بەکارهێنانی ئاسانە.

4- لە هەموو تەمەنێك بەکار دێت.

5- بە ئاسانی دەست دەکەوێت و بڕیارو سەرپەرشتی پزیشکی ناوێت.

6- کار ناکاتە سەر هۆرمونەکانی لەش.

7- تا ڕاددەیەك قەدەغەی تووش بـوون بـە نەخۆشـیە جینـسیە گوازراوەکـانی دەکـات وەك(سـوزەنەك وفەرمـەنگی- الـسیلان والزهـری- وئەیـدز وهـەوکردنی ڤایرۆسی جگەر).

**لایەنە نێگەتیڤەکانی ئەو ڕێگایە:**

1-لەوانەیە ئەو تورەکەیە بدڕێت، یان بێتە دەرەوە لە کاتی کرداری بەیەك گەیشتن، بەمەش بەربەستکاری هەرەس دەهێنێ.

2-حەساسیەت دروست بوون بۆ ماددەی لاستیك.

3-حەساسیەت دروست بوون بۆ ماددە ژەهراویەکانی ناو تورەکەکە.

4- هەست وچێژی کرداری جووتبوون کەم دەکاتەوە.

**بڕگەی دووەم: بەربەست بۆ ئافرەت (الوقاء للنساء)**

هـەروەك بەربەسـتی پیـاو لەهـەمان جـۆری لاسـتیك دروسـت کـراوەو درێژیەکەی 17سم.

## لایەنە پۆزەتیڤەکانی:

1- ئەگەر پیاوەکە ڕازی نەبوو بە دانانی بەربەست، ئەوا ئافرەتەکە بەکاری دەهێنێ.

2- کەمتر ئافرەت تووشی حەساسیە دەکات، بەبەراورد لەگەڵ بەربەستی پیاو.

3- بەرگری لە تووش بوون بە نەخۆسیە جنسیە گوازراوەکان دەکات.

4- ڕێژەو کاریگەرو سەرکەوتنی دەگاتە 80-95 ٪.

5- دەتوانێ چەند کات ژمێرێك پێش جووتبوون دابنرێ.

## لایەنە نیگەتیڤەکانی:

1- دانان ودەرهێنانی لای هەندێ ئافرەتان گرانە.

2- ملی دەرەوەی تورەکەکە لەدەرەوەدا دیارە ئافرەت بێزار دەکات.

3- ڕێژەی کاریگەری وسەرکەوتنی لە جۆری هۆرمونەکان زۆر کەمترە.

4- لە هەندێ وولاتان گرانەو کەم دەست دەکەوێت.

5- هۆکارە بۆ سەرهەڵدانی خوران وبرین وهەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ.

بڕگەی سێیەم: هەندێ ڕێگەی تر هەیە بۆ بەربەستکاری لە ئافرەتان وەك: سپێرمە کوژەرەکان( Spermicides): یەك کات ژمێر پێش جووتبوون بەکار دێت، بەلام کەف و شافی دامێن Cervical cap, Diaphragm, Dutch cap-Valut cap ئەوانە 8-48 کات ژمێر پێش جووتبوون بەکاردەهێنرێ.

### لایەنە باشەکانی:

1- وەك هۆرمونەکان کاریگەری لابەلای زۆر نیە.

2- بەرگری لە نەخۆشیە جینسیە گوازراوەکان دەکات.

3- پەیوەندی بە شیر پێدان نیە.

4- ترسی هەوکردن وسك پڕی دەرەوەی منداڵدانی نیە.

**لایەنە خراپەکانی:**

1- حەساسیە بۆ ماددەی پلاستیك وژەهرەکان.

2- ئەگەری هەوکردنی ئەندامەکان.

3- ناتوانرێ راستەوخۆ دوای منداڵبوون بەکار بهێنرێ.

## بەنـــدی ســـێیەم: رێکخـــستنی سروشـــتی خێـــزان ( تنظـيم الأســرة طبيعياً[1] . (Natural family planning).

### برگەی یەکەم: بەکار هێنانی رۆژ ژمێر

ئەوەش بەوە دەبێت کەوا ژن وپیـاو دووربکەونـەوە لـە کـرداری جووتبـوون لـەو ماوەیەی کە دایکەکە هێلکـە دادەنێـت، بۆیـە پێویـستە کـاتی پێگەیـشتنی هێلکـەو دەرچوونی لەناو هێلکەدان بزانرێ تاوەکو ئەو رێگایە سەرکەوتوو بێ.

1- گـۆڕانی پلـەی گـەرمی جەسـتەی ئـافرەت: 0.5 پلـە بـەرز دەبێتـەوە بـۆ ماوەی 3 رۆژ.

2- گۆڕانی خەستی دەردراوەکانی کۆئەندامی زاوزێ.

3- گۆڕانکاری لە کۆئەندامی زاوزێ.

4- گۆڕانکاری دەروونی وئارەزووی جینسی.

ئەگەر سـووڕی مانگانـەی ئـافرەت رێـك بێـت، ئـەوا ئـافرەت دوای 7 رۆژ لـە بـێ نوێژی هێلکەی پێگەیشتوو دەر دەهاوێژێت، ئەویش ماوەی دوو رۆژ دەژیت، ئەگـەر سپێرم نەهات لەو ماوەیـەدا ئـەوا هێلکـە دەمرێـت. دەرهاویـشتنی هێلکـە زۆر جـار چەند رۆژێك پێش دەکەوێت یان دوا دەکەوێت چەند رۆژێك.

بۆ پارێزگاری و قەدەغە کردنی سـك پـڕی پزیـشکان وا بـە چـاك دەزانـن کـە لـە

---

*1 – Lean Speroff et al. A clinical Guide forcontraception, P: 395.*
*- James R. Danforths Obstetric & Gynecology. P: 554.*

هەردوو هاوسەر لە ڕۆژی 12-17 ی سووڕی مانگانە لێك نزیك نەبنەوە، بۆ زیاتر دڵنیایی دەڵێن واچاکە لە ڕۆژی 8-21 بێت.[1] چۆنیەتی دیاری کردنی ئەو ڕۆژانە بەم شێوەیە:

1- ئافرەتەکە 6 مانگی یەك لە دوای یەك چاودێری ژمارەی ڕۆژەکانی سووڕی مانگانەی خۆی دەکات.

2- ئافرەت 18 ڕۆژ دەردەکات لە کورتترین ماوەی سووڕی مانگانە.

3- ئافرەت 11 ڕۆژ دەردەکات لە درێژترین سووڕی مانگانە.

گریمان کورتترین سووڕی مانگانە 26 ڕۆژ بوو، درێژترین سووڕی مانگانەش 32 ڕۆژ بوو، ئەوا: 26-18= 8 ڕۆژ،32-11= 21 ڕۆژ

نێوان ئەو دوو ژمارەیە کە 8-21، ئەو ڕۆژانەیە ئەگەری ئەوەی لێ دەکرێت ئەگەر جووتبوون ڕوویدا، ئەوا لەوانەیە پیتێنی هێلکە ڕووبدات وسك پڕی دروست ببێ، بۆیە بەو ماوەیە دەڵێن(ڕۆژانی پیتێن وزاوزێ- Fertility days).

**لایەنە باشەکانی:**

1- پێویست بە بەکارهێنانی حەب ودەرزی ودەزگای بەربەستکاری ناکات.

2- ماکی خراپی نیە بۆ سەر ئافرەتەکە.

**لایەنە خراپەکانی:**

1- ڕێژەی شکست خواردنی زۆرە.

2- ڕۆژەکانی دوورکەوتنەوە لە کرداری جووتبوون زۆرە.

3- نەگونجاوە بۆ ئەو ئافرەتانەی سووڕی مانگانەیان ناڕێکە، یان خوێندارن.

---

*1– Stuart.Combell&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 73.*
*- James R. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 554.*
*- Stanly.G.Clayton et al. Gynaecology by ten teachers. P: 300.*

4- نەگونجاوە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە پێیان وتراوە نابێت بەهیچ شێوەیەك منداڵیان ببێ، چونکە ڕێژەی شکستی بەرزە.

| 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | 7 |
| | | | | | |
| 24 | 23 | 22 | | | |
| 30 | 29 | 28 | 26 | 26 | 25 |

7 — ڕۆژەکانی بێ نوێژی لە مانگێکدا.

(ڕەش) — ئەگەری ڕۆژەکانی هێلکە دانان وڕوودانی پیتێن

9 — ڕۆژەکانی کە دەتوانرێ جووتبوونی تیادا ئەنجام بدرێت.

## بڕگەی دووەم: شیرپێدانی سروشتی[1]

میکانیزمی ئەو ڕێگایە ئەوەیە دەبێت ئافرەتەکە6 مانگ شیری خۆی بداتە منداڵەکە بە بەردەوامی تاوەکو کرداری هێلکە دانان ڕابوەستێنێ.

### لایەنە پۆزەتیڤەکانی:

1- ڕێژەی کاریگەری بەرزە، پێویستی بە بەکار هێنانی دەرمان ودەزگا نیە.

2- کۆرپەلە دەپارێزێ لە بەد خۆراکی لەو ماوەیەدا، چونکە شیری دایك هەموو پێداویستیەکانی منداڵی تیایە.

3- پەیوەندی سۆزداری نێوان دایك ومنداڵەکە زیاد دەکات.

---

*1 — RuthA.Lawrence. Breast Feading. P: 100, 617*
*- Christor Badcock K,T.J ,Evolutionary psychology. P: 215, 216.*
*- James Akre. Infant Feeding. P: 74,207.*
*-Stuart&Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 143*
- البار، محمد علي، خلق الإنسان بين الطب والقرآن، ص413.
- عبد العزيز، محمد كمال، الرضاعة والفطام في الطب والقرآن، ص31.

**لایەنە نیگەتیڤەکانی:**

1- گەر هەر بەربەستێك بێتە پێش شیرپێدانی سروشتی، ئەوا کاریگەری ئەو ڕێگەیە کەم دەبێتەوە.

2- دوای شەش مانگ پێویستە ڕێگەیەکی تری بەربەستکاری بۆ ڕێگە گرتن لە سك پڕی.

3- ئەگەر دایك نەخۆشیە گوازراوەکانی هەبوو، یان هەندێك جۆر دەرمانی وەردەگرت ئەوا لەوانەیە بەهۆی شیری دایکەوە بگوازرێنەوە بۆ منداڵەکە.

## بڕگەی سێیەم : دەرهاویشتنی ئاو لە دەرەوەی زێ (القذف خارج الرحم)

ئەوەش کارێکە کۆنترۆل کردنی زۆر ئاسان نیە، چونکە لەوانەیە ژمارەیەکی زۆر لە سپێرم بڕژێت پێش هاویشتنی کۆتایی، یان پیاوەکە خۆی بۆ نەگیرێ و کارەکە هەرەس بهێنێ.

## بەندی چوارەم: نەزۆك کردن - خەساندن (التعقیم – terilization)[1]

بە واتای نەزۆك کردنی هەردوو ڕەگەز، واتە نەهێشتنی ئاوی شەهوە (سپێرم وهێلکە) وکرداری منداڵبوون. بە شێوەیەکی گشتی بەکار دێت بۆ ئەوانەی کە زۆر بەتەمەنن ومنداڵیان زۆرە، یان بۆ ئەوانەی کە منداڵی شێواو ناتەویای بۆماوەییان (تشوهات خلقیە– الّمراج الوراپیە) دەبێت بە بەردەوامی.

## بڕگەی یەکەم: نەزۆك کردنی ئافرەت (تعقیم المرأة):

ئەو کردارە بۆ ئەوەیە تاوەکو سپێرم نەگاتە هێلکە، نەزۆك کردنی ئافرەت بەهۆی یەك لەو ڕێگایانەی خوارەوە دەکرێت.

---

*1– Stuart &Cristoph . Obstetric by ten teachers. P: 76–75.*
*-James R Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecolog. P: 563–562.*
*- Marcuce Filshie. Contraception Science & Practice. P: 295.*

أ- بە هۆی بەستانی جۆگەی هێلکە، یان بڕینی ولابردنی بە تەواوی (ربط أو قطع الأنبوب الفالوب- Blockage of F.T).

ب- هەلگرتنی بنبڕی منداڵدان (استئصال الرحم- Hysterectomy )

ئەو کردارەش ئەنجام دەدرێت بە: دووربینەوە، دانانی بازنە (الحلقة أو القراصة)، بڕینی کارەبایی (القطع الكهربائي- Electrothermy)، گەرمایی بڕەپ) الحرارة النافذة- Diathermy).

**کاریگەرە لابەلاکانی:**

1- بریندار بوونی ئەندامەکانی ناوەوە.

2- سك پڕی لە دەرەوەی منداڵدان.

## بڕگەی دووەم: نەزۆك کردنی پیاو

ئەو کردارە ئەنجام دەدرێت بە بڕینی جۆگەی گوێزەرەوە بۆ بەرگری هاویشتنی سپێرم. ئەو کردارەش ئەنجام دەدرێت بە: دووربینەوە، دانانی بازنە، بڕینی کارەبایی، گەرمایی بڕەپ، ماددەی ڕەق کەرەوە(المواد المتصلبة- Sclerosing (agents

## کاریگەرە لابەلاکانی (ماکە خراپەکانی)

1- هەوکردنی شوێنی نەشتەرگەریەکە.

2- خوێن بەربوون.

3- شێرپەنجەی جووتە گون وپرۆستات.

4- ئەوەی لە هەمووان گرنگترو ترسناکترە ئەوەیە: هەرکاتێ هەردوو هاوسەر ناچار بوون کە منداڵیان ببێ لەبەر هەندێ هۆکار، یان ئارەزوویان لە منداڵ بوو، ئەوا هەگیز ناتوانن، چونکە ئەو کردارە نەشتەرگەریە ناتوانرێ پوچەڵ بکرێتەوە (إنهاء أو ابطال التعقيم- Vasectomy Reversal)وەك ڕێگەکانی تری

بەربەستکردن.

ئەو هۆیانەی وا دەکات کە هاوسەرەکان پەشیمان ببنەوە لە نەزۆك کردنی خۆیان:

1- مردنی منداڵەکان بە هەر هۆیەك بێت.

2- هێنانی ژنی دووەم. 3- گۆڕانی میزاج و بیرو بۆچوون.

3- گۆڕانی باری ئابووری بۆ باشتر، ئەگەر نەزۆکیەکە بەهۆی نەبوونی وهەژاری بوو بێت.[1]

*1– Marcuce Filshie. Contraception Science&Practice. P: 297.*

# باسی سێیەم

## حوکمی بەربەستکاری لە شەریعەتی ئیسلام

## (الحكم العزل وطرق منع الحمل وتحديد النسل في الشريعة الإسلامية)

بەندی یەکەم: فەرموودەکانی هاتوون دەربارەی بەربەستکاری

بەندی دووەم: ڕای زانایانی مەزهەبەکان لەسەر بەربەستکاری

بەندی سێیەم: ڕای زانایانی سەردەم لەسەر بەربەستکاری

بەندی چوارەم: جۆرەکانی حوکمی بەربەستکاری

بەندی پێنجەم: چۆنیەتی پێکەوە گونجاندی قەدەغە کردن وڕێگە پێدانی بەربەستکاری لە دوو فەرموودەی جیا

بەندی شەشەم: ڕەزامەندی ئافرەت لە بەربەستکاریدا

بەندی حەوتەم: ماوەی بەربەستکاری کردن

بەندی هەشتەم: جۆرەکانی بەربەستکاری لە ڕووی چۆنیەتیەوە، هۆکاری نەهی وقەدەغەکردنی هەر یەکیان.

بەندی نۆیەم: پاساوەکانی بەربەستکاری

بەندی دەیەم: هۆکارە ڕاستەقینەو شاراوەکانی لە دوای ئەو بانگەوازی دیاری کردنی نەوەکان

بەندی یانزەم: چارەسەری کێشەی بەربەستکاری

## باسی سێیەم: حوکمی بەربەستکاری لە شەریعەتی ئیسلام

### بەندی یەکەم: فەرموودەکانی هاتوون دەربارەی بەربەستکاری

1- لە جابری کوڕی عەبدولاوەﷺ [1]: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ، وتی: کەنیزەکم هەیە دەچمە لای، بەلاَم نامەوێت منداڵی ببێت. پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (( بەربەست بکە گەر ویستت، ئەوەی لە قەدەری خوا بۆی دانراوە هەر ئەو دەبێت)). ((أعزل عنها إن شئت فإنه سيأتيها ما قدر لها)).[2]

2- لە ئەبو سەعیدی خودریەوەﷺ، کەنیزەمان بەرکەوت، ئێمەش بەربەستیمان دەکرد لێیان، لە پێغەمبەری خوامانﷺ پرسی لەو بارەیەوە، فەرمووی: (( ئەوە ئێوە وا دەکەن؟ سێ جار فەرمووی، هەر نەفسێك تا ڕۆژی دوایی گەر خوا بیەوێت هەبێ، هەر دەبێت)) .((أو أنكم لتفعلون؟ قالها ثلاثاً، وما من نسمة كائنة إلى يوم القيامة إلا هي كائنة)).[3]

3- جابری کوڕی عەبدولاﷺ وتی: ئێمە بەربەستمان دەکرد لە سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ وقورئان دەهاتە خوارەوە. قال: (( كنا نعزل على عهد رسول اللهﷺ والقرآن ينزل)).[4]

4- ئەبو سەعیدی خودریﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی دەربارەی بەربەستکاری: ((تۆ دەی خولقێنی؟ تۆ ڕزق وڕۆزی دەدەیت؟ فەرمانی دەرچووە، ئەوە قەدەرە)) (( أنت تخلقه؟ أنت ترزقه؟ أقرّه قراره، فإنما ذلك القدر)).[5]

---

1ـ جابر بن عبد الله بن عمرو بن خزام الأنصاري: هاوەڵێکی بە ڕێزە، فەرموودەی زۆری هەیە، پەیمانی عەقەبەو زۆربەی غەزوەکانی دیووە. لە شاری مەدینە وەفاتی کردووە ساڵی 78ك . ابن حجر ،الإصابة،434/1. وابن الجوزي، عبد الرحمن بن علي، صفة الصفوة، 129/1.

2 ـ مسند إمام أحمد، الرقم:15142، 193/5 . وأبو داود.2173، 252/2.

3ـ البخاري: 67- للنكاح باب: العزل الحديث: 5210 ،378/9.

4 ـ البخاري: 67- لنكاح باب:العزل، الحديث: 5209، 378/9.

5 ـ مسند الإمام أحمد،الرقم:3،11521/ 53.والشوكاني،نيل الأوطار،الحديث:2791، 200/6.

5- جابری کوڕی عەبدولاﷺ دەڵێ: ئێمە کەنیزەمان هەبوو، بەربەستیمان دەکرد، یەهودیەکانیش دەیان گووت: ئەوە زیندەبەچاڵی بچوکە، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خواﷺ لەو بارەیەوە، فەرمووی: (( یەهودیەکان درۆیان کرد، گەر خوا ویستی خولقاندنی بوایە، ئەوا ئەی خولقاندوو نەدەتوانرا بەرگری لێ بکەن)) قال: كانت لنا الجواري وكنا نعزل، فقالت اليهود إن تلك الموءودة الصغرى، فسئل رسول الله ﷺ عن ذلك فقال:(( كذبت اليهود، لو أراد الله خلقه لم تستطع ردّه)).[1]

6- جوزامەی کچی وەهەب[2] دەڵێت: لە پێغەمبەری خواﷺ پرسیار کرا دەربارەی بەربەست، ئەویش فەرمووی: ((ئەوە زیندەبەچاڵی شاراوەیە)). ((ذلك الوأد الخفي)).[3]

7- عومەری کوڕی خەتابﷺ دەڵێ: (( پێغەمبەری خواقەدەغەو نەهی لە بەربەست کردووە لە ئافرەتی ئازاد بەبێ پرسی خۆی)).(( نهى رسول الله ﷺ أن يعزل عن الحرة إلا بإذنها)).[4]

## بەندی دووەم: ڕای زانایانی مەزهەبەکان لەسەر بەربەستکاری

1- شافیعیەکان: پیاو دەتوانێت وبۆی ڕەوایە کە بەربەستی ئاوی شەهوە بکات لە خێزانی- ئاوەکە لە دەرەوەی زێ فڕێ بدات، ئەوەش (الكراهة التنزيهية)، هەندێکیان دەڵێن: ڕەزامەندی خێزانەکەی دەوێت، ئەوانی تر دەڵێن: ڕەزامەندی خێزانەکەی ناوێت.[5] هەروەها دەربارەی ئەو فەرموودەی ووتراوە، کە وەك

---

1ـ سنن أبي داود، كتاب النكاح، باب:العزل، الرقم:252/2171،2. والشوكاني،نيل الأوطار الحديث:2790، 199/6. وابن حجر العسقلاني، شرح البخاري، 383/1.

2 ـ جذامة بنت وهب: لە مەککە موسڵمان بووە وکۆچی کردووە بۆ مەدینە، فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەری خواﷺ لە عائیشە، مسلم وأبو داود والنسائي فەرموودەکانیان نوسیووە. کحالة، أعلام النساء، 157/1.

3 ـ مسلم مكتاب: النكاح، باب :العزل،17/10.ونيل الأوطار الحديث:200/2793،6. والمستدرك، 77/4.

4 ـ مسند الإمام أحمد:212، 31/1. وسنن ابن ماجه، الرقم:1928، 625/1.

5ـ الفيروزآبادي، المهذب في الفقه الإمام الشافعي، 67/2. وابن حجر، فتح الباري،269/9.

زیندەبەچاڵی شاراوەیە، گووتیانە: ئەوە واتای کەراهیەتە نەوەك حەرام کردن.[1]

ئیمامی نەوەوی لە شافیعیەکانە دەڵێ: بەربەستکاری لەلای ئێمەوە مەکروهە، بۆ هەر ئافرەتێك بێت- ئازاد یان کەنیزە- ڕەزامەندی هەبێت یان ڕەزامەندی نەبێت، چونکە ئەو کارە بنبڕ کردنی نەوەکانە، زیندەبەچاڵی شاراوەیە، لەناوبردنی منداڵبوونە، هەروەك کوشتنی منداڵێکە دوای لە دایك بوون زیندەبەچاڵ بکرێت.[2]

2-حەنەفیەکان: ئەو کارەیان ڕەوا کردووە بەمەرجی ڕەزامەندی ئافرەتەکە، چونکە مەبەست لە جووتبوون، منداڵبوونە، ئافرەتیش مافی خۆی هەیە لە بوونی منداڵ، بە بەربەست کردن ئەو مافەی ئافرەت دەفەوتێ، بۆیە ڕەزامەندی ئافرەت پێویستەو مەرجە.[3]

بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی کە عومەری کوڕی خەتاب دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەر خواﷺ: ((پێغەمبەری خواﷺ بەربەستی قەدەغە کردووە لە ئافرەتی ئازاد بەبێ ڕەزامەندی خۆی)) ((نهى رسول الله ﷺ أن يعزل عن الحرة إلا بإذنها)).

3- حەنبەلیەکان: ڕەوایە بەربەستکاری بە ڕەزامەندی ئافرەت: قەدەغەیە بەربەست کردن لە ئافرەتی ئازاد، چونکە منداڵبوون مافی ئافرەتیشی تیایە، بەربەست زیانی بۆ ئەویش هەیە، بۆیە ڕەزامەندی ئافرەت پێویستە.[4]

4- مالیکیەکان: بەربەستکاری ڕەوایە بە ڕەزامەندی ئافرەت، جا چ بەخۆڕایی یان بە بەرامبەر.[5]

5- زاهیریەکان: بەربەستکاری لە ئافرەتی ئازاد وکەنیزە نا ڕەوایە،[6] بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیە: ((ئەوە زیندەبەچاڵی شاراوەیە)).

ئیبن حەزمی زاهیری دەڵێ: ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە

---

1ــ الغزالي،أبو حامد محمد، إحياء علوم الدين، 47/2.
2 ــ مسلم بشرح النووي، 9/9-10.
3ــ الكاساني، علاء الدين، أبوبكر بن مسعود، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، 334/2.
4ــ ابن عابدين، رد المحتار على الدر المختار، 379/2 . وابن قدامة، المغني، 132/8.
5 ــ الدردير، مختصر أبي ضياء سيدي خليل، 226/2.
6ــ الظاهري، ابن حزم، المحلى، 70/10.

بەربەستکاری قەدەغەیە، ئەو فەرموودەیەش ئەوانی تر نەسخ دەکاتەوە. ئیمامی عەلی بەربەست کردنی بە مەکروهە داناوە، ئیمامی عومەریش لە کوڕەکانی خۆی داوە لەسەر بەربەستکاری.[1]

هەروەها دەڵێ: من دژی ئەو ڕایانەم کە دەڵێت: فەرموودەی جوزامە بە ڕاشکاوی بەو واتایە نایەت کە قەدەغەی بەربەستکاری بکات، چونکە بەیەك چواندنی بەربەست بە زیندەبەچاڵی شاراوە واتای حەرام کردن نیە.[2]

## بەندی سێیەم: ڕای زانایانی سەردەم لەسەر بەربەست کردن

1- یوسف قەرزاوی: بێ گومان مانەوەی جۆری ئادامیزاد یەکەم مەبەستی دروست کردنی خێزان وهاوسەرێتی یە، مانەوەی نەوەی ئادەمیزادیش بەو ڕێگەیە نەبێ نابێت. ئاینی ئیسلامیش هانی زۆربوونی نەوەکانی داوە، پیرۆزی لە زۆری کوڕو کچ کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی داوە بە دیاری کردنی ژمارەی نەوەکان ئەگەر پێویست بوو، لەگەڵ بوونی هۆکاری گونجاو.[3]

2- وەهبەی زوحەیلی:( جائیزە بەکارهێنانی بەربەستی سك پڕی نوێ وەك حەب ودەرزی وڕێگەکانی تر بۆ ماوەیەکی کاتی، بەڵام بەمەرجێ نەبێتە هۆی نەزۆکی بەردەوام، بنبڕکردنی منداڵبوون.[4]

3- ئەحمەد شەرباصی: ( ڕای پەسەند ئەوەیە بەربەستی کاتی بەکاربهێنرێ، بەواتای ئەوەی کە بتوانرێ بە ئاسانی لابردرێ کاتی پێویست، لەوانەیە هەندێ نەخۆشی ببنە هۆی بەربەستکاری، چونکە چارەسەری ئەو نەخۆشیە ئێستا لامان قورسە، بەڵام لەوانەیە پاش ماوەیەکی تر ئەو نەخۆشیانە چارەسەریان دەدۆزرێتەوە، بەو هۆیەوە هۆکاری بەربەستەکە نامێنێ وبەربەستکاریەکەش هەڵدەگیرێ، بەو شێوەیە دەتوانین ئەو دوو حالەتە ببەستین بەیەکەوە، دانانی

1- العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري، 383/9.
2- الظاهري، ابن حزم، المحلى، 70/10.
3- القرضاوي، يوسف، الحلال والحرام في الإسلام، ص191.
4- الزحيلي، وهبة، الفقه الإسلامي وأدلته، 2644/7.

بەربەست کاتی پێویست، لادانی کاتی نەمانی هۆکاری بەربەستکاری. [1]

4- موحەمەد رمضان بوطي: ( زۆربەی فەرموودەکان لەگەڵ ئەوەن کەوا بەربەست کردن جائیزە، هەرچەندە وا دیاردەدەن کەوا مەکروهە. بە بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئایا مەکروهە یان جائیزە، شەریعەتی ئیسلام ڕێگە و ڕوخسەتی داوە بۆ هەموو تاکێك لە کۆمەڵگە بۆ ماوەیەکی کاتی بەربەست کردن - بەو شێوەیەی کە گونجاوە بۆی- بەمەرجێ زیانی بۆ خۆی وخێزانی وکۆمەڵگە نەبێ. [2]

5- سەید سابق: ئەگەر پیاوەکە منداڵی زۆر بوو، باری ئابووری باش نەبوو، نەیتوانێ پەروەردەیان بکات، یان ئافرەتەکە لاواز بوو، یان سکەکانی زۆر لە دوای یەك و نزیك بوو، لەو حالەتانەدا دەتوانن بەربەست بکەن. هەندێ لە زانایان دەڵێن: لەو حالەتانەدا بەربەست نەك تەنها جائیزە بەڵکو ڕێگەپێدراوو باشە (المندوب والمستحب). [3]

## بەندی چوارەم: جۆرەکانی حوکمی بەربەستکاری

پاش ڕوون کردنەوەی پوختەی ڕای زانایان، حوکمی بەربەستکاری ئەوانەن: 1- ناپەسەند- مەکروهی تەنزیهیە (الکراهة- کراهة التنزیه):

ئەوە ڕای شافیعیەکانە بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی جوزامە ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: بەربەستکاری وەك زیندەبەچاڵی شاراوەیە.((ذلك الوأد الخفي)).

2- نەهی و قەدەغە کراوە (منهي عنه):

أ- بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە ((أو أنكم لتفعلون؟ قالها ثلاثاً، وما من نسمة كائنة إلى

1ـ الشرباصي، أحمد، يسألونك في الدين والحياة، 250/1.
2ـ البوطي، مسألة تحديد النسل وقاية وعلاجاً، ص24-25، ص62.
3 ـ سيد سابق، فقه السنة، 194/2.

يوم القيامة إلا هي كائنة)). هەندێ لە زانايان دەڵێن: ئەو فەرموودەيە تا بێتە بەڵگە لەسەر ئەوە كە موباحە، ئيبن سيرين دەڵێ: ئەو فەرموودەيە زياتر نزيكە لـە نـەهى وقەدەغە كردن. ئيمـام حەسـەنى بەصـرى دەڵـێ: ئـەو برگەيـەى فەرموودەيـە(( لا عليكم أن لا تفعلوا)) زۆر لە زەجرو پێ نـاخۆش بـوون دەچێت. ئيمـامى قورتـوبى دەڵێت: ئەوە بۆ داكۆكيە لەسەر نەهى وقەدەغە.[1]

ب- بـە بەڵگـەى ئـەو فەرموودەيـەى پێغەمبـەرى خـوا ﷺ كـە ئـەبو سـەعيدى خودرى رضي الله عنه دەيگێڕێتەوە((أنت تخلقه؟ أنت ترزقه؟ أقرّه قراره، فإنما ذلك القــدر)). چـونكە خـواى گـەورە خـۆى رزق و رۆزى دەدات،بۆيـە نابـێ لەترسـى سـك پـڕى بەربەستكارى بكەن.

ئيمامى نەوەوى دەڵێ: ئەگەر بەربەسكاريتان نەكرد، ئەوا لە زيانەكانى مەترسـن چونكە خولقاندنى هەموو نەفسێك بە قەدەرو ويستى خوايە. ئەوەى بيەوێ بخولقـێ هەر دەبێت جا گەر بەربەسكاريتان كرد يان نا، ئەوەى نەيويستووە بيخولقێنێ هەر نابێ جا گەر بەربەستكارى بكەن يان نـا. كەواتـە سـوود لـە بەربەسـتكارى نـابينن، چونكە گەر ويستى خواى لەسەر بوو ئەوا ئاوەكە پێشتان دەكەوێت.[2]

3- بەربەستكارى جائيزە (جواز العزل):

جائيزە بەربەستكارى بە مەرجى پێويستيەكى شەرعى، وەك ئەوەى لـە نـاو بـێ باوەڕان بژيت و لە پاشەڕۆژى مندالەكەى بترسێ، يان لە مەيدانى جەنگ بوون، يـان خـاوەن كەنيزەكـە حـەزناكات كەنيزەكـەى منـدالى هـەبێت چـونكە دوايـى ناتوانـێ خزمەتى بكات، يان لەبەر بێ هێزى ئافرەتەكە يـان مندالەكـە بێـت. بـەم بەلگانـەى خوارەوە:

أ- بەبەلگـەى ئـەو فەرموودەيـەى پێغەمبـەرى خـواﷺ كـە ئـەبو سـەعيدى خودرى رضي الله عنه گێڕاويەتيەوە:((أعزل عنها إن شئت فإنه سيأتيها ما قدر لها)).

1 ـ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري، 381/9.
2 ـ فتح الباري، 10/10.

ب- جابری كوڕی عەبدوڵاﷺ ووتی: ئێمە بەربەستمان دەكرد لە سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ وقورئان دەهاتە خوارەوە. قال: (( كنا نعزل على عهد رسول الله ﷺ والقرآن ينزل)).[1]

ئەو فەرموودەیە بە بەربڵاوی وتەواوی (المطلـــق) بە واتای ئیباحەو حەڵاڵی نایەت، هەردوو ڕوو هەڵدەگرێ: بەواتای نەهی دێ، لەهەمان كات بەواتای بەربەستكاری دێت بەمەرجی پێویستی، وەك ئەوەی پیاوێك منداڵی زۆر بوو نەیتوانی بژێویان دابین بكات لەبەر هەژاری .

ئیمامی غەزالی دەڵێ: [2]ترسان لە منداڵ زۆری، خۆ پاراستن لە بێزاری بوون بە هۆی ئەوانەوە، ئەوە نەهی لێ ناكرێ، بەڵام تەواوی وچاكە ئەوەیە كە پشت بە خوا ببەستێت ودڵنیا بێت لە ڕەحمەت وبەزەیی خوا [3]، چونكە فەرموویەتی:﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾ هود: 6.

ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ڕێگەو ڕوخصەی بەربەستكاریان داوە، لەوانە: ئیمامی عەلی، سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، زەیدی كوڕی ثابت، جابری كوڕی عبد الله، ئیبن عەباس، حەسەنی كوڕی ئیمامی عەلی، خوبابی كوڕی ئەرث، ئەبو سەعیدی خودری، ئیبن مەسعود. [4]

4- جائیزە بە شێوەیەكی تەواو بڵاوی – موتلەق (جواز العزل مطلقاً) :

جابری كوڕی عەبدوڵاﷺ دەڵێ: ئێمە كەنیزەمان هەبوو، بەربەستیمان دەكرد، یەهودیەكانیش دەیان گووت: ئەوە زیندەبەچاڵی بچوكە، پرسیار كرا لە پێغەمبەری خواﷺ لەو بارەیەوە، ئەویش فەرمووی: ((یەهودیەكان درۆیان كرد، گەر خوا

---

1 ـ البخاري: 67- النكاح باب: العزل، الحديث: 5209، 378/9.

2ـ الغزالي: محمد بن محمد الغزالي الطبرسي، فەیلەسوف، زاهید، سۆفی، لە ساڵی 450ك لەدایك بووە، زۆر زیرەك بووە، سەرەتا خۆی خەریكی زانستی بێ سوود كرد دوایی تۆبەی كرد، كتێبی زۆرە، خۆی خەریكی زانستی فەرموودە كرد، لە ساڵی 505ك لە خۆراسان كۆچی دوایی كرد . الذهبي، سير أعلام النبلاء، 322/19.

3ـ الغزالي، إحياء علوم الدين، 47/2.

4ـ الجوزية، ابن قيم، زاد المعاد، 435/4.

ویستی خولقاندنی بوایە، ئەوا ئەی خولقاندوو نەدەتوانرا بەرگری لێ بکەن)).

5- حەرام کردن وقەدەغەکردنی بەربەستکای بە موتلەقی (تحريم العزل مطلقاً): لە جوزامەی کچی وەهەب دەڵێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیار کرا دەربارەی بەربەست، ئەویش فەرمووی: ((ئەوە زیندەبەچاڵی شاراوەیە)). ((ذلك الوأد الخفي)).

ئیبن حەزمی زاهیری دەڵێ: ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەربەست کردن قەدەغەیە، ئەو فەرموودەیەش ئەوانی تر نەسخ دەکاتەوە. ئیمامی عەلی بەربەست کردنی بە مەکروهە داناوە، ئیمامی عومەریش لە کوڕەکانی خۆی داوە لەسەر بەربەست کردن

## بەندی پێنجەم: چۆنیەتی پێکەوە گونجاندی قەدەغە کردن و ڕێگە پێدانی بەربەستکاری لەو دوو فەرموودەیە (التوافق بين التحريم والإباحة).

ئیمام ئیبن قەیم لەو بارەیەوە دەڵێ: ئەو فەرموودەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((كذبت يهود)). لەبەر ئەوە بەدرۆی خستونەتەوە چونکە ئەوان وایان گومان دەبرد کەوا لەگەڵ بەربەستکاری هەرگیز سك پڕی نابێت. گەر وا بێت ئەوە بنبڕ کردنی نەوەکانە، کەواتە وەك زیندە بەچاڵی شاراوەیە. بەڵام بەربەستکاری ڕێگە ناگرێ لەوەی کە خوا ویستبێ بیخولقێنێ نەخولقێ، بەڵکو ئەوەی ویستی لەسەر بوو ئەیخولقێنێ بەربەست بکات یان نا. هەروەها دەڵێ کە ناوی بردووە بە زیندەبەچاڵی شاراوە لەبەر ئەوەیە تەنها مەبەست ونیەت وقەسدی پیاوەکە ئەوە بووە کە ئافرەتەکەی لە سك پڕی دوور بکاتەوە. هەر لەبەر ئەوە ناوی براوە بە زیندەبەچاڵی شاراوە. جیاوازی نێوان زیندەبەچاڵی شاراوەو زیندەبەچاڵی ڕاستەقینە ئەوەیە: یەکەمیان تەنها مەبەست ونیەت وقەسدە، بۆیە بە شاراوە ناوی بردووە بەڵام ئەوەی تر ڕاستەقینەیە، نیەت وکرداری پێکەوە لەگەڵدایە.[1]

1 ـ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري، 382/9. وابن قيم الجوزية، زاد المعاد، 437/4.

## بەنـدی شەشـەم: ڕەزامەنـدی ئـافرەت لـە بەربەسـتکاریدا (رضـا -إذن- الزوجة).

1- بەڵگەی قورئانی:

ئیمام جەصاص[1] دەڵێ: لەسـەر پیـاو واجبـە بچێتە لای خێزانـی ومـافی خـۆی بداتێ، چونکە خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ﴾ النساء: 129 نابێ وای پـێ بکـات لـەو ناوەنـدە بێـت، هاوسـەری هەیـە بـە نـاو، بـەڵام بـە کـردار نیەتی.[2]

2- بەڵگەی فەرموودەکان:

أ- بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی کە عومەری کوڕی خـەتاب ﷺ دەیگێڕێتـەوە لـە پێغەمبەر خوا ﷺ:(( پێغەمبەری خوا ﷺ بەربەستی قەدەغـە کـردووە لـە ئـافرەتی ئازاد بەبێ ڕەزامەندی ئافرەتەکە)) ((نهى رسول الله ﷺ أن يعزل عــن الحــرة إلا بإذنها)).

ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی عومەری کـوڕی خـەتاب ﷺ گێراویەتیـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـەوا دوای ڕەزامەنـدی ئـافرەت بەربەسـتکاری موباحـە، چـونکە بەربەستکاری، ئافرەت بێ بەش دەکات لە چێژی جووتبوون، بێ بەشی دەکـات لـە منداڵبوون، هەرکاتێك ئافرەت خۆی ڕازی بوو بـەم بڕیـارە (بـێ بـەش بوونـە)، ئـەوا بەربەستکاری جائیزە.[3]

---

1ــ الجصاص:أبو بكر أحمد بــن علــي: یەکێکە لـە گـەورە پیـاوانی مەزهـەبی حەنـەفی، زاهیـد وخواپەرست بووە، بۆتە سەرۆکی پیـاوانی مەزهـەب، قوتـابی لـە زۆر شـوێنەوە بـۆ لای هـاتوون، کتێبـی زۆری داناوە، لە ساڵ 370ك کۆچی دوایی کردووە. ابن كثير، البداية والنهاية، 261/11.

2ــ الجصاص، أحكام القرآن، 374/1.

3ــ ابن قدامة، المغني، 24/7 . والكاساني، بدائع الصنائع، 374/2.

ب- لە عەبدوڵای کوڕی عمرو کوڕی عاص[1] ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیستوومە بە ڕۆژ بە ڕۆژویت وبەشەویش تا بەیانی خوا پەرستی دەکەیت، ووتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی:(( ئاوا مەکە، بەڕۆژوبە و بەڕۆژو مەبە، شەو هەڵسە بۆ خوا پەرستی وهەندێ کاتیش بخەوە، چونکە جەستەت مافی بەسەرتەوە هەیە، چاویشت مافی بەسەرتەوە هەیە، خێزانەکەشت مافی بەسەرتەوە هەیە)) . (( فلا تفعل. صمْ وأفطر، وقم ونم، فإن لجسدك عليك حقاً، ولعينك عليك حقاً وإن لزوجك عليك حقاً)).[2]

ج- لە ئیبن عەباسەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((زیانتان بۆ خۆتان وبۆ کەسی تر نەبێ)) ((لا ضرر ولا ضرار)). [3]

هەموو مەزهەبەکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە بەربەستکاری ڕەزامەندی خێزانی دەوێت، تەنها هەندێ لە شافیعیەکان نەبێ، چونکە جووتبوون چۆن مافێکی پیاوە بەسەر ئافرەتەوە، ئاواش مافێکی ئافرەتە بەسەر پیاوەکەی گەر هیچ بیانوویەکی نەبێت.[4]

3- بنەمایەکی فیقهی (القاعدة الفقهية): (( زیان بە ڕێگەی شەرعی لادەدرێ)). (الضرر يزال شرعاً ).[5]

ئافرەت مافی بەسەر پیاوەوە هەیە، ئەگەر مافی نەدرێت واتای پێ گەیاندنی زیانە بەو ئافرەتە، بەربەستیش هۆکارە بۆ نەمانی لەزەت وخۆشی جووتبوون، واتە بەربەست زیانە بۆ ئافرەتەکە، کەواتە ڕەزامەندی ئەو پێویستە.

---

1 ـ عبد الله بن عمرو بن العاص الأموي:پێش باوکی موسڵمان بوو، پیاوێکی زاناو داناو عاقل بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی دا فەرموودەکانی وەربگرێ، لەگەڵ باوکی فەتحی شامی بینی، هەروەها صەفەیین، لەساڵی 63ك کۆچی دوایی کردووە. ابن الأثير، أسد الغابة، 128/5.

2 ـ البخاري 30- كتاب الصوم باب: 55 الحديث: 1975، 277/4.

3ـ مسند الإمام أحمد ،326/5. وابن رجب، عبد الرحمن بن شهاب، جامع العلوم والحكم، 207/2. وسنن البيهقي الكبير،156/6 .

4ـ ابن قدامة، المغني، 30/7.

5 ـ خلاف، عبد الوهاب، علم أصول الفقه، ص234.

كەواتە بەربەستكاری بۆ پێویستی وبیانوەكی شەرعی جائیزە پاش ڕەزامەندی ئافرەت. بەڵام بەربەستی منداڵ نەبوون بە مەبەستی ئەوەی ئافرەت جوانی لەشی وڕوكاری دەرەوەی تێك نەچێت، یان بۆ كەم بوونەوەی نەوەكان بێت، ئەوا جائیز نیە چونكە پێچەوانەی مەبەستەكانی نیكاح و ژیانی هاوسەرێتی یە. هەروەها زۆربوونی نەوەكان مافێكی شەرعی و كۆمەڵایەتی وگشتی یە، كە لە پێشترە لە ماف وبەرژەوەندی تاكێك لە كۆمەڵگە. ڕەزامەندی ئافرەت (ئازاد بێ یان كەنیزە) وەرناگیرێ لەو حالەتانەدا:

أ- حەنەفیەكان دەڵێن:( ئەگەر لەناو بێ باوەڕی شەڕ خواز بێت (دار الحرب)، یان ئافرەتەكە ڕەوشتی باش نەبێت وپیاوەكە ئارەزوو نەكات منداڵی لەو ئافرەتە هەبێت، چونكە نیازی ئەوەی هەیە دەستی لێ بەردات.[1]

لە كتێبی (فتح القدير شرح الهداية)دا هاتووە:( ئەگەر پیاوەكە ترسا لە منداڵ لەبەر تێكچوونی خوڕەوشت وگۆڕانكاری سەردەم ئەوا مافی ڕەزامەندی وەرگرتنی ئافرەت نامێنێ.[2]

ب- لە كتێبی (كشاف القناع)ی حەنبەلیەكان دا هاتووە دەڵێن: بەربەستكاری لە ئافرەتی ئازاد وكەنیزە جائیزە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی، گەر موسڵمان لە وڵاتی بێ باوەڕی شەڕخواز بوو.[3]

هاوسەرێتی بۆ قازانجی هەردوو ڕگەزە، لادانی دەردو بەلای ئارەزووی جینسە، بۆیە چۆن پیاوەكە دەوێت بەلای شەهوەی جینسی لەسەر خۆی لابەرێ بە جووتبوون، ئەواش دەبێت مافی ئافرەتەكە بدات ئەو بەلایەی شەهوەی جینسی لەسەر لابدات. هەروەها هاوسەرێتی هۆكاری بوونی منداڵ ودروست بوونی خۆشەویستی و چاو داگرتن وئارام گرتنی دڵەكانە.[4]

---

1 ــ ابن عابدين ، رد المحتار، 176/3.
2 ــ ابن الهمام، فتح القدير شرح الهداية، 494/2.
3ــ الحنبلي، منصور بن إدريس، كشاف القناع عن متن الإقناع، 112/3.
4 ــ الحنبلي، كشاف القناع عن متن الإقناع، 31/7.

## بەندی حەوتەم: ماوەی بەربەستكاری كردن (المدة المسموح بها للعزل).

لای ئیمامی غەزالی تەنها چوار ڕۆژ ڕەوایە.[1] یان چوار مانگە، هەروەك ئەوانەی سوێند دەخۆن كە نەچن بەلای خێزانیان.[2] هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾البقرة: 226.

ئیمامی ئیبن حەزم دەڵێ هەر پاكبوونەوەیەك یەك جارە، واتە: هەر 28 ڕۆژ جارێك بچێتە لای خێزانی، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە:﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: 222.[3]

ئیمام ئیبن تەیمیە دەڵێ: مافی ئافرەت بۆ نزیك بوونەوە لە مێردی خۆی ماوەی دیاری نیە، بەڵكو پەیوەستە بە قەناعەتی ئافرەت وتوانای جینسی پیاوەكە، بەمەرجێ پیاوەكە شەكەت نەكات ولە ئیش وكاری ڕۆژانەی دوور نەخاتەوە.[4]

## بەندی هەشتەم: جۆرەكانی بەربەستكاری لە ڕووی چۆنیەتیەوە، هۆكاری قەدەغەكردنی هەر یەكیان.(أنواع العزل من حيث الكيفية والعلة في النهي عنه).

### 1- بەربەستكاری بەهۆی ژن نەهێنان (العزل بترك النكاح أصلاً)

ئاینی ئیسلام هانی موسڵمانان دەدات بۆ پێكهێنانی ژیانی هاوسەرێتی، چونكە سوودی جەستەیی، دەرونی، كۆمەلایەتی، ڕامیاری زۆری هەیە. خوای گەورە دەفەرمووێ: پێغەمبەرانی زۆرمان بۆ ناردن خێزان ومنداڵمان پێدان ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ﴾ الرعد: 38

---

1 ـ الغزالي، إحياء علوم الدين، 46/2.

2 ـ ابن قدامة ، المغني، 31/7 .

3 ـ الظاهري، ابن حزم، المحلى،40/10.

4 ـ البعلي، علاء الدين علي بن محمد، الاختيارات الفقهية من فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية، ص247.

ئیبن عومەرﷺ دەڵێ: ئێمە کۆمەڵێ گەنجی لات وەژار، لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ بووین، فەرمووی: (( ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەر یەکێك لە ئێوە گەر توانای هەیە با ژن بهێنێ، چونکە باشترە بۆ چاو داگرتن، پاراستنی داوێن، ئەوەی کە ناتوانێ با بەڕۆژو بێ)). (( یا معشر الشباب، من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فأنّه أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم فإنّه له وجاء)).[1]

لە قەتادەی کوڕی دەعامەوەﷺ[2] دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ نەهی لە ژیانی ڕەبەنی کردووە. ((لا رهبانية في الإسلام)).[3]

حافیز دەڵێ فەرموودەی بەم شێوەم نەدیوە تەنها ئەو فەرموودە نەبێ کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص[4] بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( خوای گەورە لە جیاتی ڕەبەنایەتی ئاینێکی پاکی لێ بووردەی بۆ ئێمە ناردووە)). (( إن الله أبد لنا بالرهبانية الحنيفية السمحة)).[5]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوەﷺ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( ژن بێنن ومنداڵتان ببێ، بەم شێوەیە من شانازی بە ئێوە دەکەم لە ناو گەلانی جیهان ڕۆژی دوایی)) ((تناكحوا تناسلوا فإني أباهي بكم الأمـــم يوم القيامة)).[6] ئیبن قودامە دەڵێ: مەبەستی ئەو فەرموودە ئەوەیە هانمان دەدات کە هۆکاری منداڵبوون بگرینە بەر .[7]

---

1ـ البخاري 70- النكاح ، باب: 3 ، حديث: 4779، 1950/5 .ومسلم: 16-النكاح، باب: 1 حديث:1-1422، 1422/3. وسنن أبي داود: كتاب النكاح ، باب: التحريض علـــى النكـــاح حديث: 2046، 2/ 219.

2ـ قتادة بن دعامة بن قتادة الدوسي:یەکێکە لە زانایانی تابعینەکان، ئیبن حەنبەل وتی: یەکێکە لە باشترین زانایانی شاری بەصرە، زاناو موفەسیرو فەقیهێکی شارەزا بووە. ابن كثير، البداية والنهاية، 313/9.

3ـ الشوكاني، نيل الأوطار، الحديث:2624، 103/6. التبتل: واتە دوور کەوتنەوە لە ژن هێنان ونزیك بوونەوە لە خوا پەرستی.

4ـ سعد بن أبي وقاص بن مالك: لە تەمەنی 17 ساڵیدا موسڵمان بووە، یەکێکە لەو 10 کەسانەی کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، سەرکردەی جەنگی قادسیەی بووە. لە ساڵی 55 ك کۆچی دوایی کردووە. سير أعلام النبلاء، 92/1.

5ـ الطبراني،المعجم الكبير، 62/6،والشوكاني،نيل الأوطار باب:الحث على النكاح، 107/6.

6ـ سنن أبي داود، الرقم:2،220/2050. والسيوطي، جلال الدين، الجامع الصغير، 517/1.

7ـ ابن قدامة، المغني، 23/7.

2- وازهێنان لە جووتبوون پاش ژن هێنان (ترك الجماع بعد النكاح)

ئەو کارەش پێچەوانەی مەبەستی وئامانجەکانی ژن هێنانە، کە بریتین لە زۆربوونی نەوەکان، هەروەها پێ شێلی مافی ئافرەتە، بەوەی بێ بەشی دەکات لە چێژی جووتبوون و منداڵبوون. لە فەرموودەیەك هاتووە کە چوونە لای ئافرەت یەکێکە لە صەدەقەکان وپاداشی هەیە لای خوای گەورە.

لە ئەبو زەڕی غەفاریەوە[1] دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((پاداشت بۆ هەیە کاتی چوویتە لای خێزانت)).((..ولك في جماع زوجتك أجر)).[2]

ئیبن قەیمی جوزی دەڵێ: بەربەستکاری پێچەوانەی ئامانج ومەبەستەکانی ژن هێنانە، کە ئەویش زیاد کردنی نەوەکانە، بەڵام بەربەستکاری بڕینی ئەو هۆکارەیە، خراپی مامەڵەیە لەگەڵ هاوسەر، بڕینی ئەو چێژە سروشتیەیە کە فیترەت دایناوە، هەر بۆیەش کۆمەڵی زانایان ئەو کارەیان بە ناپەسەند داناوە.[3]

(...چۆن پیاو مافی هەبوونی منداڵی هەیە، ئافرەتیش بە هەمان شێوە، هەر بۆیە ڕەوا ترە منداڵ لە ئامێزی دایکی پەروەردە بکرێت).[4]

ئیبن حەجەری عەسقەلانی لە کتێبی (فتح الباري) دەڵێت: مەکرەهو ناپەسەندە لەبەر ئەوەی مافی ئافرەت پێ شێل دەکات، ئازاری جەستەیی پێدەگات، دژایەتی قەدەری خواشی تیایە.[5]

---

1ـ أبو ذر الغفاري: جندب بن جنـادة. یەکێکە لە هاوەڵان، زاهید وڕاست گۆ بووە، سەرەتای بانگەوازی ئیسلام موسڵمان بووە، لە شاری ڕەبەدەساڵی 31 ك کۆچی دوایی کردووە. ابـن حجـر، الإصابة،125/7. والذهبي، سير أعلام النبلاء، 46/2.

2ـ مسلم، باب: الصدقة في كل معروف، 697/2. ومسند أحمد، الرقم: 21511، 167/5.

3ـ ابن قيم الجوزية، زاد المعاد، 437/4.

4ـ ابن قيم الجوزية، زاد المعاد، 437/4.

5ـ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري، 384/9.

3- ڕشتنی ئاوی ئارەزوو لە دەرەوەی زێ (قذف الماء خارج الرحم)

ئەو کارەش ئافرەت بێ بەش دەکات لە چێژی ڕشتنی شەهوە، مافی منداڵبوون، لەگەڵ ئەوەشدا زانایان ڕێگەیان داوە پاش ڕەزامەندی ئافرەتی ئازاد. ئیمامی غەزالی دەڵێ: ژن نەهێنان، واز هێنان لە جووتبوون دوای ژن هێنان، ڕشتنی ئاوی شەهوە لە دەرەوە، هەموو ئەوانە هەموو ڕێگەن بۆ بەربەستکاری، وازهێنانیان باشتر، بەڵام تاوانکاری نیە. چاکترین شت، کە لە دەست دەچێت بە هۆی بەکارهێنانی بەربەستکاری، ئەویش منداڵبوونە، کە سوودی بۆ موسڵمانان و بۆ کاری تێکۆشان زۆرە.[1]

4- هۆکارە نوێ یەکانی بەربەستکاری (الوسائل الحديثة)

لە باس وبەندەکانی سەرەوە بە درێژی باسمان کردن، هەروەها کاریگەرە نیگەتیڤەکان ولابەلاکانی هەریەکێك لەوانەمان باس کرد، هەر لەبەر ئەو زیانانەشە ئەو کارە بە کارێکی ناپەسەند لەقەلەم دراوە لای زۆربەی زانایانی مەزهەبەکان.

5- بنبڕ کردنی نەوە (استئصال النسل- العقم الدائمي)

نەزۆکی کردن(خەساندن): بە واتای ئەوە دێ کە پیاو یان ژن ڕێگەیەك بەکار بهێنن بۆ بنبڕ کردنی ئارەزووی جینسی، یان توانای جینسی، بەمەرجێ ببێتە هۆی لەکار کەوتنی کرداری سك پڕی ومنداڵبوون.

ئەحمەد شەرباصی دەڵێ: هەندێ لە زانایانی سەردەم نەزۆکی کردنیان ڕێگە داوە، بەبەڵگەی ئەوئایەتە:﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ الشورى:50 کە خوای گەورە هەندێ کەسی نەزۆك کردووە، هەر زاتی خۆی زاناو خاوەن دەسەڵاتە. زانایان دەڵێن مادام خوای گەورە هەندێ کەسی نەزۆك کردووە بۆ حیکمەتێك، کەواتە قەدەغە نیە یەکێك نەزۆك بکرێ بۆ بەرژەوەندیەك.[2]

1 ــ الغزالي، إحياء علوم الدين، 47/2.

2ــ الشرباصي، يسألونك في الحياة والدين، 249/1.

لە کتێبی (نهاية المحتاج)ی شافیعیەکاندا هاتووە: (پرسیارێك لە شیخ عزالدین کرا دەربارەی بەکارهێنانی ژن یان پیاو دەرمانێك بۆ بەربەستکردنی سك پڕی، گووتی: نابێت و حەرامە، هەروەها شیخ عیمادی کوڕی یونس هەمان فەتوای داوە. پرسیار کرا ئەگەر هەردوو هاوسەر ڕازی بوون بەم کارە، وەلامی داوە کە نابێ(جائیز نیە). ئەوەی لێرە مەبەستیان بووە کە وازهێنانە لە منداڵبوون بە شێوەیەکی یەکجارەکی. لێرەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت کە دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان نەزۆکی کاتی ونەزۆکردنی یەکجارەکی کە بەهیچ شێوەیەك جائیز نیە.[1]

موحەمەد ڕەمەزان بوطی دەڵێ: بۆ هیچ ئادەمیزادێکی ڕاست ودروست نیە بچێت شێوەی خۆی، یان پێکهاتەی جەستەیی، یان سیفەتێکی خۆڕسکی خۆی نەهێڵا یان بگۆڕێ بە ئەنقەست، چونکە ئەوە خراپترین هەڵگەڕانەوەیە لە بەندایەتی کردنی بۆ خوای خولقێنەر وخاوەن حیکمەت.[2]

خوای گەورە دەفەرمووێ دەربارەی هەڵگەڕانەوەو خۆ بەزل زانینی شەیتانی گەورە وفەرمان کردنی بە دەست وپێوەندەکانی بۆ هەوڵدان بۆ گۆڕینی مەخلوقاتی خوا وهەڵگەڕانەوەیان: ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ﴾ النساء: 118. هەندێ لە زانایان دەڵێن ئەوە مەبەستی خەساندن وکوتانی پێستەیە (الخصاء والوشم).[3]

ئیمامی زەهەبی[4] دەڵێ: ئەوە لە گوناهە گەورەکان بە بەڵگەی ئەو دوو فەرموودەیە: لە سەمرەﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر یەکێك بەندەیەکمان بکوژێ دەیکوژین، هەر یەکێك لووتی بەندەیەکمان ببڕێ لووتی

---

1ـ الرملي، شمس الدين، محمد بن أحمد، نهاية المحتاج إلى شرح المنهاج ومعه حاشية أبي الضياء نور الدين الشراملي، 416/8.

2ـ البوطي، تحديد النسل، ص33.

3ـ الطبري، جامع البيان، 386/4.

4ـ الذهبي، شمس الدين، محمد بن أحمد، الكبائر، ص159. والذهبي:أبو عبد الله محمد بن أحمد: ئیمام وزانا، مێژوو نووس، لە سالی 673 ك لە دیمەشق لە دایك بووە، سەفەری زۆری کردووە بۆ بەدەست هێنانی زانست، کتێبی زۆری هەیە. لە دیمەشق سالی 748ك کۆچی دوایی کردووە. الشوكاني، البدر الطالع، 110/2.

دەبڕين، هەريەكێك بەندەيەكمان بخەسێنێ ئێمەش ئەو دەخەسێنين)). ((من قتـل عبده قتلناه، ومن جدع عبده جدعناه، ومن أخصاه أخصيناه)). [1]

لە ئيبن عومەرەوە:ﷺ (( پێغەمبەری خوانەهی كردووە لـە خەسـاندنی ئەسـپ ورەشە وولاخ)). ((نهى النبيﷺ عن إخصاء الخيل والبهائم)).[2] ئەگەر خەسـاندن و نەزۆك كردنی گيانداران قەدەغە بێت، كەواتە بۆ ئادەميزاد ئەو قەدەغە كردنە ئـەولا ترە.

دەربـارەی ديـاری كردنــی نــەوەكان لەســەر ئاســتی وولات، د.بـاجوری دەڵــێ: پێويستە جياوازی نەكەين لە نێوان تاك ودەوڵەت بەرامبەر حوكمی ئـەوەی كـە ئايـا جائيزە يان نا، هەروەك چۆن خێزانێك ڕووبەڕووی هەنـدێ بـاری نالـەبار دەبێـت، وا دەخوازێ بەربەستكاری بكەن، بەهەمان شێوە وولاتيش لەوانەيە ڕووبەڕووی هەندێ كێشە ببێت كە وا بخوازێ سەركردە هەمان بڕيار دەربكات وهەموو پێداويستيەكان بۆ ئەو بڕيارە ئامادەبكات تاوەكو كۆمەڵگە بتوانـێ ژمـارەی نـەوەكانی ڕێـك بخـات. ئەو زانايانەی كە ئەو ڕايەيان هەيـە ئەوانـەن: بـەهی الخـولی، ئەحمـەد شەرباصـی، موحەمەد تەقی نەبهان، چونكە ئەوانە ئيباحـەی بەربەسـتكاری دەكـەن بـەبێ هـيچ كەراهيەتێك.

لە هەندێ وولات ژمارەی دانيشتوان وژمارەی منـداڵبوون كـەم بۆتـەوە بـە هـۆی پـەيڕەو كردنــی بڕيـاری بەربەســتكاری بــە شــێوەيەكی ڕەسمــی، وەك: بــەريتانياو فەرەنـسا، هەرچـەندە ڕێـژەی پێكهێنـانی خێـزان تيايانـدا بــەرزە بــەڵام ڕێــژەی منداڵبوون تيايان‌دا نزمە. خشتەی ژمارە(1):

---

1ــ النسائي، سنن النسائي بشرح السيوطي وحاشية الإمام الـسندي، 21/8. وقيـل إسـناده ضعيف.

2ــ مسند الإمام أحمد ،الرقم: 2769، 250/2.

خشتەی ژمارە (1) ڕێژەی دابەزینی منداڵبوون دیاری دەدات لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، بەهۆی بەربەستکاری

| وڵات | بەرزبوونەوەی ڕێـژەی زەواج | دابەزینی ڕێژەی منداڵبوون |
|---|---|---|
| فەرەنسا | ٪ 7.6 | ٪ 28.2 |
| ئەڵمانیا | ٪ 9.4 | ٪ 49.4 |
| ئیتالیا | ٪ 9.8 | ٪ 29.2 |
| هۆڵەندا | ٪ 10.2 | ٪ 35.0 |
| سوید | ٪ 11.3 | ٪ 45 |
| دانیمارك | ٪ 12.3 | ٪ 35.6 |
| سویسرا | ٪ 12.9 | ٪ 44.8 |
| ئینگلیتەرا | ٪ 13.3 | ٪ 51.0 |
| نەرویج | ٪ 26.0 | ٪ 38.0 |

ئەگەر ئەو بڕیارە لـە وڵاتـانی ئیـسلامیش پـەیڕەو بکرێـت ئـەوا هـەمان کێـشەو گیروگرفت ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. ئەو بڕیارەش پێچەوانەی مەبەستەکانی ئیـسلامە لە زیاد بوونی نەوەکان. کێشەکانیش بە کورتی ئەمانەن:[1]

1- زۆربوونی بەد ڕەوشتی.
2- بڵاو بوونەوەو زیاد بوونی نەخۆشی جینسی گوازراوە.
3- جیاوازی چینایەتی.
4- زۆر بوونی ڕێژەی تەلاق.
5- کەم بوونەوەی ڕێژەی منداڵبوون.

1 ـ الباجوري، جمال محمد، المرأة في الفكر الإسلامي، 2/26-27.

عەبدولکەریم زیدان دەڵێت: نابێ بۆ دەوڵەت و فەرمانگەکانی فەرمان بکەنە سەر خەڵك بۆ بەکار هێنانی دەرمان وڕێگەکانی تری بەربەستکاری، ئەوە لەسەر ئاستی وڵات حەرامەو بەهیچ شێوەیەك جائیز نیە، چونکە دەبێت وڵاتانی ئیسلامی بە هێز بێت، یەکێك لە بنەماکانی بەهێزی بریتیە لە زۆری ژمارەی دانیشتوان، یەکێك لە هۆکارەکانی زۆربوونی دانیشتوان بریتیە لە بەرزی رێژەی منداڵبوون.[1]

پوختەی باسەکە: حەرامە هەر یەکێك چ ئافرەت چ پیاو هۆکارێك لە هۆکارەکانی بەربەستکاری بەکار بهێنێ ببێتە هۆی لەناوبردن وقەڵاچۆکردنی نەوەکان. لەبەر ئەوەی ئەوە دەست تێوەردان وگۆڕانکاریە لە دروست کراوەکانی (مەخلوقاتی) خوا، پێچەوانەی مەبەستەکانی پێکەوەنانی خێزانە، هەڵگەڕانەوەشە لە فەرمانەکانی خوا، بەزاندنی سنوورەکانی مافی ئادەمیزادەکان وکۆمەڵگەیە، بانگەوازێکی نەفامانەو تێکدەرانەیە، جا ئەو بڕیارە لەژێر هەر دروشم وناونیشانێك و بەڵگەیەك بێت، خاوەنی ئەو جۆرە بانگەوازانەش پێویستە بەرپەچیان بدرێتەوە بە توندی.

## بەندی نۆیەم: پاساوەکانی بەربەستکاری (مبررات العزل - تنظيم الأسرة)

ئەو بابەتە هەمووی لەسەر دوو تەوەرە بەندە، یەکەمیان: هەڕەشە بۆ دایکەکە، هەڕەشە بۆ سەر ئەو منداڵەی کە لە دایك دەبێت، یان ئەو منداڵانەی کە پێشتر لە دایك بوون لە بواری تەندروستی، کۆمەڵایەتی، پەروەردە، خەرجی وئابووری.

1- پاساوەکانی تەندروستی بۆ ڕێکخستنی خێزان(المبررات الصحية لتنظيم الأسرة)

أ- بە مەبەستی پاریزگاری کردن لە ئافرەتێکی نەخۆش، تاوەکو نەخۆشیەکەی زیاد نەکات، یان باری تەندروستی نەخاتە مەترسیەوە کاتی سك پڕی ومنداڵبوون، وەك: نەخۆشیەکانی پەیوەندی دار بە کۆئەندامی زاوزێ کە بەربەستە لەبەردەم

---

1- عبد الكريم زيدان، مفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم، 261/7.

هاتنه دەرەوەی کۆرپەلەکە، یان وەك هەندێ نەخۆشی گشتی: نەخۆشیەکانی دڵ و گورچیلە، بەرزی پەستانی خوێن، ئەو نەخۆشیانە گشتیان کاریگەری نیگەتیڤیان هەیە لەسەر منداڵ ودایکەکە.

ب- بە مەبەستی ئەوەی دایك بتوانێ دەرمانەکانی وەربگری وکار نەکاتە سەر کۆرپەلەکەی، وەك دەرمانەکانی دژی شێرپەنجە، چونکە ئەو دەرمانانە بەگشتی کاریگەری نیگەتیڤیان هەیە لەسەر کۆرپەلە بەتایبەتی لە سێ مانگی یەکەمی تەمەنی کۆرپەلە، واتە قۆناغی خولقانی کۆرپەلە.

ج- بە مەبەستی پارێزگاری دایك لەو پاڵەپەستۆیەی دەکەوێتە سەری بە هۆی سك پڕی، بە تایبەتی گەر پێشتر نەشتەرگەری سکی یان کۆئەندامی زاوزێی بۆ کرابێ لە کاتێکی نزیکدا.

د- بە مەبەستی پاراستنی ئافرەتی سك پڕی بەتەمەن(35ـ 45) ساڵ لە کرداری منداڵبوونی کێشەدار، هەروەها پاراستنی نەوەکان لە شێواوی بۆماوەیی کە لەو تەمەنەدا زۆر باوە، یان پاراستنی ئەو کچەی لەتەمەنی بچوك شوی کردووە لە مەترسی کێشەکانی منداڵبوون.[1]

هـ- بەمەبەستی گەڕانەوەی کۆئەندامی زاوزێ بۆ باری ئاسایی جارانی دوای شێوانیان بە هۆی سك پڕیەکانی پێشوو، بەتایبەتی گەر لە شەش سك زیاتری کرد بوو. کاریگەریەکانی ئەو سکە یەك لەدوای یەکانە:

* دابەزینی هێزی جەستەی ئافرەت، لە ئەنجامی کەم خوێنی وداخوڕانی ئێسقانەکان.

* کەم بوونەوەی هێزی پەروەردەکردنی منداڵەکانی، بێ بەشیان لە سۆزو چاودێری تەواوو پارێزگاریان.

* نەتوانینی بەردەوام بوون لە شیرپێدان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو، کە زۆر پێویستە بۆ هەموو منداڵێك.

---

1ـ النسيمي، محمود ناظم، الطب النبوي و العلم الحديث، 104/2.

* بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن لەگەڵ بەرز بوونەوەی ڕێژەی منداڵبوون.

و- بەمەبەستی پارێزگاری کۆرپەلە لە نەخۆشیە بۆماوەییەکان وگوازراوەکان، کە دەبنە هۆی مردن، یان شێوانی کۆرپەلە، یان تووش بوونی بە نەخۆشی پلە جیا جیا. ئەوەش دەکەوێتە ناو ئەو دەروازەی فیقهی کە دەڵێ: لادانی زیان لەپێشترە لە بە دەست هێنانی بەرژەوەندی (درء المفاسد -المضار- مقدم على جلب المصالح). یان دەکەوێتە دەروازەی هەڵبژاردنی کەمترین زیان (ارتكاب أخف الضررين.) [1]

ز- بەمەبەستی پارێزگاری کۆرپەلە لەو زیانانەی کە تووشی دەبێت بە هۆی کاریگەری ژەهراوی ئەو دەرمانە بێ هۆش کەرانەی کە دایك وباوکی وەری دەگرن، یان ئەو ماددە کیمیاویانەی کە دایك وباوکی لە کارگەکان دووچاری دەبن. [2]

2- پاساوەکانی ئابووری (المبررات الاقتصادية)

لە سەدەی بیستەمدا پاساوەکانی ئابووری شێوەیەکی بەرفراوانی وەرگرتووە، پێشتر تەنها بە شێوەیەکی تاکی ئەنجام دەدرا بەوەی کەوا پیاوێك لەبەر ناتاسایی باری ئابووری بەربەستی بەکار دەهێنا لەگەڵ خێزانی، بەڵام لەم دواییەدا بە هۆی ئەو بیردۆزە ڕەشبینیە ئابووریانە وای کرد بەربەستکاری شێوەیەکی نێونەتەوەیی وەردەگرێ. ئەو بیردۆزەش باس لەوە دەکات کەوا ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی زیاد دەکات بە شێوەیەکی یەك لە دوای یەکی هەندەسی(Exponentially) واتە(2,4,8,16،32،64،128)، بەڵام سەرچاوەکانی بژێوی و ڕزقی خەڵك زیاد دەبێت بە شێوەیەکی یەك لە دوای یەکی حیسابی(Arithmetically) واتە(1,2,3,4,5,6)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا پاش ماوەیەکی تر سەرچاوەکانی بژێوی کەم دەبێتەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو بەرزبوونەوە زۆرە ژمارەی دانیشتوان، بەمەش برسیەتی ڕوو لە زەوی دەکات و قات وقڕی دروست

---

1 ــ خلاف، عبد الوهاب، علم أصول الفقه، ص235.
2 ــ النسيمي، الطب النبوي، 106/2.

دەبێت. ئەو بیردۆزە ڕەش بینیە (النظرية التـشاؤمية Pessimistic - theory of economics) ( مالثوس 1766-1834) دایناوە.

بەڵام لای موسڵمانان ئەو بیردۆزە بـە شـتێکی زۆر نەفامانـە لەقەڵـەم دەدرێـت، چـونکە ئـەوە نیـشانەی بـێ باوەڕیـە بـە خـوای گـەورەو دەسـەڵاتی ویـەیمان وبەڵێنەکانی. خوای گەورە زەوی بۆ ئێمە کردۆتـە شـوێنی ژیـان، هـەموو شـتەکانی تیایـدا لـە خزمـەتی ئـادەمیزاد دانـاوە، بەرەکـەتی تیـا خـستووەو ڕزق وڕۆزیـشی بەقەدەر ژمارەی خەڵکەکە داناوە لە هەموو کات وهەموو شوێنێك. لە هەندێ ئایەتی تردا دەفەرمووێ ڕزق وڕۆزیتان لە ئاسمانەوە بـۆ دێـت. بـەڵام ئـەوەی وای کـردووە خەڵکانێك برسی بن لەسەر زەوی ئـەوە بەهۆی نـا ڕێکـی لـە دابـەش کـردن، داگـیر کردن وچەوساندنەوەی بە هێزەکانە بۆ بێ هێزەکان، بیردۆزی سـەرمایەداری وزۆری هۆکـاری تـرە کـە بابـەتی ئـەو پـەڕاوە شـوێنی ئـەو باسـانەی نیـە تـاوەکو ڕوونـی بکەینەوە.[1]

ئەوانـەی بانگەشـەی دیـاری کردنـی نـەوەکان دەکـەن ئـەو بیانوانـە دەهێننـە پێشەوە:

1- ترسی گرانی وقات وقڕی لە داهاتوودا بەهۆی زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی.

2- ترسان لە کەم بوون وپەککەوتن لە خـەرجی(عجـز الانفـاق) پێویـست بـۆ نەوەکانی دواڕۆژ.

ئەوانە دەڵێن گەر فریای خۆمان نەکەوین وژمـارەی دانیـشتوان کـەم نەکەینـەوە ئەوا وداهاتی خەڵك کەم دەبێت، ژمارەی بێ کاری زۆر دەبـێ، برسـیەتی هەڕەشـە دەکاتە سەرمان.

1 ــ محاضرات الاقتصاد الصحي لطلبة الدكتوراه/ كلية الطب، 2008. قنـاة الجزيـرة ، برنامج: الشريعة والحياة، لفضيلة الشيخ : يوسف القرضاوي.

3- پاساوەکانی کۆمەڵایەتی وپەروەردەیی (المبررات الاجتماعية والتربوية) خاوەنی بانگەشەی دیاری کردنی نەوەکان هەندێ پاساوی کۆمەڵایەتی دەهێننەوە لەوانە:

أ- چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن.
ب- بانگەشەی خۆشەویستی سەربەست وئازاد (دعوى الحب الحر).
أ- چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن.

چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی دانانی بەربەستکاری و بانگەشەی دیاری کردنی نەوەکان، چونکە کاتێ هەردوو هاوسەر دەچنە دەرەوە ناتوانن چاودێری منداڵەکانیان بکەن وپەروەردەیان بکەن تاوەکو ببنە ئەندامێکی بە سوود بۆ کۆمەڵگە، بەڵکو دەیانەوێت لە لێپرسراویەتی ومانـدوو بوونی منداڵ پەروەردە کردن ڕزگاریان بێت.

لە ئەوروپا پاش ئەوەی ئافرەت چووە دەرەوە بۆ کار کردن، تاوەکو بێتە خاوەن پارەی گیرفانی خۆی ویەکسانی خۆی بسەلمێنێ لەگەڵ پیاو، وای لە زۆربەی گەنجان(کوڕ و کچ) کرد لە جیاتی پێکهێنانی خێزان تەنها شەهوەی جینسی خۆیان تێر بکەن لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرێتی، هەسادەت وپولەکی وای لێ کردن کە کەس ئاگاداری کەسی تر نەبێت، کەس سەرپەرشتی کەسی تر نەکات، کەس هاوکاری کەسی تر نەکات هەرچەندە گەر دایك وباوکی خۆشی بێت وزۆر هەژاریش بن. بەڵام لە ئیسلامدا یاسای وا هەیە کە دەبێت هاوکاری هەموو ئەوانە بکات کە کەوتوونەتە تەنگژەی ئابووریەوە. لە کتێبی ( پیاوان و ژنان تەوکاری نا یەکسان)، بە درێژی باسی چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن وهۆکارەکانی ولایەنە پۆزەتیف ونیگەتیفەکانمان خستۆتە ڕوو.

ب- بانگەشەی خۆشەویستی سەربەست و ئازاد. بۆیە بڕیاری دیاری کردنی نەوەکانیاندا

خاوەنی ئەو بانگێشەیە ئەوانەن: کۆمەڵێك لە پیاوان دەیانەوێت تەنها ئارەزووە جینسیەکانیان تێر بکەن ودوور لە ماندوو بوون وپەروەردەی منداڵ ودابین کردنی بژێویان، هەروەها کۆمەڵێك لە ئافرەتان کە دەیانەوێ ئارەزووەکانی خۆیان تێر بکەن دوور لە سك پڕی ومنداڵبوون وشیر پێدان وپەروەردەی منداڵ. لە دوای ئەوانیش کۆمەڵێك نووسەری بیروباوەڕ ناجێگیر کە ئەو بیرۆکە نالەبارو دوور لە واقیعانەیان بۆ دەرازێننەوە، چونکە خۆیان مشەخۆرن وتوانای ئەوەیان نیە تەنها یەك خێزان بەڕێوە ببەن، لە هەمان کات دەیانەوێت بەرنامە بۆ خەڵکانی تر دابڕێژن. هەر ئەوانیش ئەو بانگەشەیان بە خۆشەویستی ئازاد (حب الحر) ناو برد.

هەروەك نووسەرێکی ئینگلیزی بە ناوی (شامگور) دەڵێ: چ پیاوێك ڕازی دەبێت بە سەربەستی خۆی بڕیار بدات وببێتە باوك وئەرکی باوکایەتی ودابین کردنی بژێوی منداڵ وخەرجی پەروەردە کردنی منداڵ بگرێتە ئەستۆ، هەموو ژیانی خۆی لەو ڕێگەیە بە فیڕۆ بدات، هەروەها کام ئافرەت ڕازی دەبێت لە بڕی شەهوەیەکی چەند خولەکی ببێتە دایك وسکی خۆی پڕ بکات بۆ ماوەی نۆ مانگ و ئەرك وفەرمانەکانی ماڵ ومنداڵ بگرێتە ئەستۆی خۆی، هەتا هەتایە بەو دەردو مەینەتیەوە بناڵێنێ. ئەوەیە تێڕوانینی ئەو فەیلەسوف ونووسەرانە بۆ ژیان ودایکایەتی وباوکایەتی، ئاخۆ دەبێ فەلسەفەی گەنجەکانیان چۆن بێت وکۆمەڵگەیان بەرەو چ هەڵدێرێ هەنگاو هەڵگرێ.

هەر ئەو فەلسەفەی مافی ئافرەت دەدات بەوەی کە لەیەك لایەنەوە دایکایەتی ڕەت بکاتەوە، بانگەشەی یەکسانی لەگەڵ پیاو بکات و بگرە لە کرداری منداڵبوونیش دەیەوێت وەك ئەو بێت. چۆن پیاو سکی پڕی نابێ ئەویش بە هەمان شێوە نایەوێت ئەو ئەرکە پیرۆزە هەڵگرێ.

ئەو بانگەشە بوو بە هۆی زۆر بەکارهێنانی حەب وڕێگەکانی تری بەربەست، ئەگەر ئەوەش سەری نەگرت ئەوا ڕێگەی لەباربردن هەیە. ئەو دوو هۆکارە کە بۆ لەناوبردنی نەوەکانی دوارۆژە ناویان بردووە بە (پیرۆزترین مافەکانی ئافرەت) بۆ بەرگری لە ژیانێکی ئاسوودەی خۆی.

**بەندی دەیەم: هۆكارە ڕاستەقینەو شاراوەكانی لە دوای ئەو بانگەوازی دیاری كردنی نەوەكان (الدوافع الحقيقية الكامنة خلف الدعوة إلى تحديد النسل).**

1- دژایەتی كردن، وەستان بەرامبەر شەریعەتەكانی ئاسمانی، گۆڕینی مەخلوقاتی خوا، چوون بەدەم بانگەوازی شەیتان، بنبڕكردنی نەوەكانی سەر زەوی، ئەمەش بڕیاری بە هیلاك چوونی بەندەكان ووێرانكاری وولاتە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ﴾النساء: 118.

2- ژیانی وولاتانی ڕۆژ ئاوا ژیانێكی ماددیە، هەر كەس تەنها بیر لە بەرژەوەندی خۆی دەكاتەوە، هەوڵ دەدات هەموو ئارەزووەكانی خۆی بە كەمترین ماوە تێر بكات وبگاتە لووتكەی تێر بوون لە هەموو شتێك، بۆ ئەنجامدانی ئەو كارەش وا دەخوازێ دوور بكەوێتەوە لە لێپرسراویەتی ماڵ ومنداڵ وهاوسەرو هاوكاری كەس وكار. ئافرەتیش بەهەمان شێوە دەیەوێت چاولێكەری پیاو وبەربەرەكانی بكات لە گشت بوارەكانی ژیان هەرچەندە گەر پێچەوانەی فیترەت و ئارەزووە خۆڕسكەكانی خۆشی بێت.

3- گرنگی دان بە هەموو ئەو شتانەی شارستانی ڕۆژئاوا هێناویەتە بەرهەم لە هۆكارەكانی ڕابواردن وخواردن وجوانكاری، تاوەكو گەیشتە ئەو ئاستەی تاكێكی ڕۆژئاوایی ناتوانێ بەبێ ئەو شتانە بژیت. بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجەش هەموو هۆكارێكی دروست ونادروست بەكاردێنێ بەبێ گوێدانە بنەماو یاساو وداب ونەریتی كۆمەڵگە، لە پێناوی گەیشتنە ئەو ئارەزووانە هەموو بەهاكانی كۆمەڵگەش دەكاتە قوربانی، هەتا ئەگەر لەناوچوونی شارستانەیت ومرۆڤایەتیش بێت. خەریكە ئێستا جیهانگیری وعیلمانیەت كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەرەو ئەو هەڵدێرە ببەن.

4- هەڵخەڵەتاندنی زۆر لە گەنجەكان بەو بانگەشە چەواشەكاریە، تاوەكو بكەونە ناو زەلكاوی بەدڕەوشتی ودوور بكەونەوە لە كاروبارو ئەركی ماڵ وخزمەتی كۆمەڵگەو فێربوونی زانست وداهێنان وپێشكەوتن. بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجانەش

ڕێگەی زۆریان داهێناوە تاوەکو تاوانەکانیان بشارنەوە وەك ڕێگەکانی بەربەست ولەبار بردنی ڕێگە پێدراو (مجاز- ڕەسمی- فەرمی) وشێری ووشك وشتی تر.

خشتەی ژمارە (2) چالاکی جینیسە نا شەرعی یەکانی گەنجانی وولاتانی ڕۆژئاوا (ئەمەریکا) ڕوون دەکاتەوە .[1]

| ٪ کچ | ٪ کوڕ | تەمەنی گەنج | |
|---|---|---|---|
| %12 | %19 | 16 ساڵ | ساڵی 1994ز |
| %32 | %31 | 17 ساڵ | |
| %44 | %58 | 18 ساڵ | |
| %58 | %58 | 19 ساڵ | |

لەو خشتەیە دیار دەکەوێت چەندە بەرەو بەسەر چوونی تەمەن دەڕۆن زیاتر وقووڵتر دەچنە ناو زونگاوی بەدڕەوشتی، هیچ شتێك نیە ئێستا بیان گەڕێننەوە سەر هۆش وڕێگەی دروستی ژیانی کۆمەڵایەتی تەنها ژان وئازاری نەخۆشی ومردن نەبێت بەهۆی ئەو نەخۆشیەکانی کە دەگوازرێنەوە بەهۆی بەدڕەوشتی وکاری جینسی بێ سنوورو نامۆ وەك، نەخۆشیەکانی ئایدزو (AIDS) هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B,C,D,G).

دەربارەی بوونی دۆستایەتی جینسی ناشەرعی، دەبینین 53٪ لە گەنجە کچەکان لە قۆناغی دواناوەندی یەك دۆستیان هەیە بۆ ئەنجامدانی کرداری جینسی نا شرعی (Illegal marage)، 21% دوو دۆستیان هەیە، 11% سێ دۆستیان هەیە، 6% چوار دۆستیان هەیە، 8% زیاتر لە چوار دۆستیان هەیە.

دەربارەی کوڕە گەنجەکان 34% یەك دۆستی کچی هەیە (Girl friend) بۆ

1— *R.H.W. Vanlunsen(2000).Contraception Choice& Realitie.P:57,58, 59.*

كرداری جینسی نا شەرعی، 20% دوو دۆستیان هەیە، 14% سێ دۆستیان هەیە، 8% چوار دۆستیان هەیە، 24% زیاتر لە چواریان هەیە.[1]

5- دوور خستنەوەو ترساندنی ئافرەت لە گرنگترین وپیرۆزترین کارەکانی ئافرەت کە دایکایەتی یە، ئەویش تەنها لەبەر خاتری مانەوەی ئافرەت لەسەر جوانی ڕوکارو دیمەن ودەرچوونی مەمك و ناسكی بالآو قەد...هتد (هەروەك بانگەشەی بۆ دەكەن)، تاوەكو لە شوێنەكانی ڕابواردن وەك ، يانەكان، مەيخانەكان، شوێنی ئاهەنگ گێڕان بە ديمەنێكی بەرچاو دەربچێت وخەڵكی تر بۆ ئارەزووەكانی كێش بكات و زياتر خۆی تێر بكات.

لە ئەنجامی ئەو فەلسەفە نا دروستە دەبینین لە ئەمەریكا ژمارەی ئەوانەی تووشی شێرپەنجەی مەمك ومنداڵدان دەبن زۆر زیادی كردووە، بە گوێرەی ئەو توێژینەوەی ساڵی 1994 كراوە. ئەوەش بە هۆی كەم بوونەوەو دابەزینی ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی كە منداڵيان دەبێت، يان شيری مەمكيان دەدەنە منداڵەكەيان، ئەو دوو كردارەش منداڵبوون وشير پێدان دوو هۆكاری سەرەكين بۆ كەمتر تووش بوون بەو جۆرە شێر پەنجانە.[2]

6- پەیدا كردنی قازانج وسوودێكی ماددی زۆر بەهۆی ئەو بانگەشە چەواشەكاريە بەتايبەتی لە وڵاتانی دواكەوتووی هەژار ( دەولەتەكانی جيهانی سێيەم)، ئەوەش بۆ ئەوەيە تاوەكو لە ڕووی ديمۆگرافيەوە[3] لاوازو بێ هێزيان بكەن، پێش ئەوەی لە ڕووی ئابووريەوە ووردوخاشيان بكەن.

لە كۆتايدا دەپرسين ئايا كەم بوونەوەی ژمارەی دانيشتوان چارەسەری كێشەی ئابووری جيهان دەكات؟ ئايا كێشەی ئابووری كيشوەری ئەفريقيا كەمی سەرچاوەكان وزۆری دانيشتوانە؟ يان دەست تێوەردانی ڕۆژئاواو ئاژاوە نانەو داگير

---

*1—R.H.W.Vanlunsen(2000).Contraception Choice&Realities.P:57,58, 59.*

*2— Ruth A. Lawrence (1999). Breast Feading. P: 229.*

3— ديمۆگرافی: ئەو ليكۆڵينەوەيە كە پەيوەندی بە زانستی دانيشتوان وسەرژمێری هەيە.

کردنیانە؟ ئایا ئەفریقیا دەوڵەمەند نیە لە نەوت وزێڕو کانزاکانی ترو سەرچاوەی ئاو؟ کەواتە بنەچەی بابەتەکە سەرهەڵدانی کێشەی ئابووری نیە بەڵکو مەبەستیان نانەوەی ئاژاوەیە لەناو کۆمەڵگەکان و هێنانە دی نیازە گڵاوەکانیانە، تاوەکو بە ئاسانی بتوانن دەست بەسەریاندا بگرن.

## بەندی یانزەهەم: چارەسەری کێشەی بەربەستکاری (کیفیة علاج مشکلة العزل ومنع الحمل).

ئێمە دەربارەی باسێکی زانستی دەدوێین کە ناوی دانانی بەربەستە، واتە رێگرتن لە سك پڕی(بەربەستکاری)، تاوەکو کرداری سك پڕی نەیەتە ئەنجام و منداڵبوون نەبێت، هەرچەندە خەڵکانی زۆر ناوی درەوشاوەو فەلسەفیان بۆ داناوە. ئەو کردارەش پاساوی زۆری هەیە بۆ ڕەوا کردن وپاسایی کردنی ئەنجامدانی، هەروەها هۆکاری زۆریشی هەیە بۆ ئەنجامدانی لەوانەی کە بە درێژی باسمان کردن لەگەڵ باسی لایەنە پۆزەتیف ونیگەتیفی هەریەکیان بەجیا. لەو بەندە باسی پاساوەکان دەکەین لەگەڵ هەوڵدان بۆ ڕوون کردنەوەیان بەشێوەیەکی زانستی، تاوەکو بگەینە ئەو ئەنجامە ئایا ئەو بەربەستکاریە پێویستە بکرێت ئەگەر ئەو پاساوانە هەبوون؟ یان ئەو پاساوانە ناتەواوەو نابنە بەڵگەو بنەمایەکی زانستی بۆ ئەنجامدانی بەربەستکاری بە تایبەتی لەسەر ئاستی کۆمەڵگە.

### 1ـ چارەسەری کێشە تەندروستیەکان

ئەو پاساوەیان لە هەموو ئەوانی تر باوترە لە کۆن ولە سەردەمی ئێستاماندا بۆ ئەوەی کرداری بەربەستکاری بۆ ئەنجام بدرێ، لەلایەن پزیشکانەوە بڕیاری بۆ دەدرێ ولەلایەن زانایانی فیقهیەوەش فەتوای بۆ دەردەکرێ.

#### یەکەم: نەخۆشی

ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە ئەو پاساوە گشتگیر دەکرێ، لەلایەن پزیشك وزانایانی ئاینی وهەروەها لەلایەن خەڵکانەوە. دەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە تەنها

ناوی نەخۆشی هۆكار نیە بۆ ئەنجامدانی بەرەبەستكاری، چونكە نەخۆشی زۆر جۆری هەیە، یان نەخۆشیەكانی هەناوە، یان جەراحی یە، یان نەخۆشی ئافرەتانە، كە زۆربەیان لەگەڵ پێشكەوتنی زانستی پزیشكی وتەكنۆلۆژی فیزیای پزیشكی چارەسەر دەكرێن، بەمەرجێ پزیشكان خۆیان تیایدا ماندوو بكەن ورەچاوی بەرژەوەندی خۆیان نەكەن. تەنها هەندێ نەخۆشی نەبێت كە پەیوەندی بە هەندەسەی بۆماوەیی وكرۆمۆسۆمەكانەوە هەیە كە تیایدا یەكێك یان چەند بۆماوەیەك لە شوێنی خۆی هەڵدەبەزێت بۆ شوێنەكی تر(Mutation)، یان هەر نارێكیەكی تر هەبێ لە ڕیزبەندی یان شێوەی بۆماوەكان.[1]

ئافرەت بە هۆی سك پڕی تووشی زیان دەبێت، لە بەرنامەی ئیسلامیش ئەو یاسایە هەیە كە نەخۆش هەندێ ئەرك وفەرمانی لەسەر دوا دەخرێت یان بەیەكجاری لا دەچێت، ئەوەش پاش ئەوەی هەموو هەوڵەكانی پزیشكی درا بۆ چارەسەری، گەر سەركەوتوو نەبوو ئەوكات بڕیار دەدرێت كە وەك نەخۆشێك مامەلەی لەگەلدا بكرێت. بەرەبەستكاری ئەوكات جائیز دەبێت لەگەڵ كەراهیەتی تەنزیهی تاوەكو ئەو زیانەی تووشی دەبێت لەسەری لا بچێت.

وەهبەی زوحەیلی دەڵێ: قەدەغە نیە بەرەبەستكاری ئەگەر ئافرەت نەخۆشیەكی ترسناكی هەبوو (مرض خطير-عضال). ئەو كات وەك ئەوە دەژمێردرێ كە هەر لە قەدەری خواوە نەزۆك بووە.[2]

خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾الشورى:50

خاڵێكی گرنگ هەیە پێویستە لە یادی نەكەین ئەویش ئەوەیە: پێش ئەوەی بڕیاری بەرەبەستكاری بۆ هەركەسێك بڕیار بدەین پێویستە ئەوەشی بۆ ڕوون بكەینەوە كەوا چۆن سك پڕی زیانی هەیە لەگەڵ نەخۆشی، ئەوا هۆكارەكانی

1 ـ الطفرة الوراثية: بریتیە لە پشێویەك لە كرۆموسۆمەكان لە ژمارە یان جۆرەكەیان، یان جولانی بۆماوەیەك لە شوێنی خۆی بۆ شوێنەكی تر. بەمەش منداڵەكە گرفتی تەندروستی زۆری تووش دەبێت. ژمارەی كرۆمۆسومەكانی ئاسایی46 xy .

2ـ الزحيلي، وهبة، الفقه الإسلامي وأدلته، 2649/7.

بەربەسـتكاریش زیانیـان هەیـە. چـۆن ئـەو بنـەما فیقهیـە لەسـەر بـەكارهێنانی بەربەستكاری پیادە دەكرێت، هەر هەمان بنەما لە بەكار نەهێنانی پیادە دەكرێت بۆ دوور كەوتنـەوە لـە زیانـەكانی بەربەست. بنەمایەكـەش دەڵێ: زیـان بـە زیـان لانابردرێت: (الضرر لا یزال بالضرر).[1]

**دووەم: بەربەستكاری لەترسی ئەو منداڵەی كە دەبێ یان ئەو منداڵانـەی كـە هـەن، یـان ترس لەسەر ئافرەتی شیردەر.**

سەعدی كوڕی ئەبی وەقـاص‌ؓ دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەری خـواﷺ ووتی: من بەربەستكاری دەكەم لەگەڵ ئافرەتەكەم چونكە خێزانەكەم شـیر دەداتـە منداڵەكەم. پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بۆچی وا دەكەیت؟ ووتی: چونكە دڵم بـۆ منداڵەكەی دەسووتێ ئەوەك شتێكی لێ بێت، ئەویش فـەرمووی:(( ئـەگەر ئـەو كـارە زیانی هەبوایە، زیان دەگەیشتە فـارس وڕۆم)).((لو كـان ضـاراً لـضر فـارس والروم)).[2]

لە جوزامەی كچی وەهەب‌ؓ دەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خـواﷺ فـەرموویـەتی: (( ویستم نەهی بكەم لە غیلە، تاوەكو باسیان كرد كە فارس وڕۆم ئەو كارە دەكەن وزیانیان پـێ ناگـات)). ((لقد هممت أن أنهي عن الغيلة [3] حتى ذكـرت أن الـروم وفارس يصنعون ذلك ولا يضر أولادهم)).[4]

ئیبن قەیم دەڵـێ: جووتبـوون لەگـەڵ ئافرەتێـك كـە شـیر بـە منداڵەكـەی دەدات حەرام نیە، ئەگەر حەرام بووایە ئەوە پێغەمبەری خواﷺ ڕوونی دەكردەوە.[5]

---

1ــ خلاف، عبد الوهاب،علم أصول الفقه، ص234.

2 ــ مسلم، كتاب النكاح، باب: وطء المرضع، 17/10. والشوكاني،نيل الأوطار،2792، 200/6.

3 ــ الغيلة: ( پیاو بچێتە لای ئافرەتی شیردەر) ابن الأثير، النهاية في غريب الحديث والأثـر، 118/2.الغيلة: (غول: غاله الشيء غولاً واغتاله: بە میلاكی برد، كوشتن ولەناو بردنە كە خۆشی پێی نازانێ. ابن منظور، لسان العرب،146/10.

4ــ مسلم ، كتاب النكاح، باب: وطء المرضع، 15/10. ومسند إمام أحمد، 27517، 406/10.

5 ــ الجوزية، ابن قيم ، زاد المعاد،18/4.

## زانستی پزیشکی و ڕوودانی سك پڕی لە کاتی شیر پێدان

لە دوای منداڵبوون ڕێژەی هۆرمونەکانی لێپرسراون لە دروست کردنی شیر کە پرۆلاکتینە (Prolactin) لە گلاندەکانی ناو مەمك بەرز دەبێتەوە، لە هەمان کاتدا ڕێژەی ئەو هۆرمونانەی کە لێپرسراون لە پێگەیشتنی هێلکەو هاتنە خوارەوەی کەم دەبنەوە بەتایبەتی ئیسترۆجین. لەبەر ئەو میکانیزمە شیر پێدان هۆکارێکی سروشتیە بۆ دوا خستنی هێلکەدانان وسك پڕی، ئەو ماوەیەش بە ماوەی نا زاوزێی سروشتی دادەنرێ (فترة عدم الخصوبة الطبيعية-Lactational Amenorhea).

ڕاپۆرتە پزیشکیەکان ئەو میکانیزمە دەسەلمێنن کە ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی شیر دەدەنە منداڵەکەیان وسك پڕیان دەبێ تەنها 3٪یە.[1] هەروەها ڕاپۆرتەکان ئەوەشیان ڕوون کردۆتەوە هۆی ئەو ڕێژەیەش کە منداڵیان دەبێ ئەوا بە هۆی ئەوەیە کە کرداری شیر پێدانەکە زۆر دروست نیەو هەندێ کەمتەر خەمی تیایە لەلایەن ئافرەتەکەوە بە هەر هۆیەك بێت.

ڕێژەی هۆرمونی پرۆلاکتین کە لە ڕژێنەی ژێر مێشکەوە دێت، پێش منداڵبوون دەست بە زیاد بوون دەکات. دوای منداڵبوون ڕاستەوخۆ شیر بۆ ناو چیکلدانەکانی مەمك پاڵدەدات، دوایی بە هۆی هۆرمونی ئۆکسیتۆسین ( Oxytocin) شیرەکە دێتە دەرەوەی مەمك. بڕی ئەو هۆرمۆنە زیاد دەکات بە چەند هۆکارێك، وەك: بینینی منداڵەکە، بیستنی دەنگی وگریانی، دەست لێدان و وبۆن کردنی، بیرکردنەوە لە منداڵەکەی.

ئەوەی لێرە گرنگە کە بەهۆی شیر پێدان ئەگەری سك پڕی کەم دەبێتەوە هەروەك باسمان کرد، بەلام هەر تەگەرەیەك بێتە پێش کرداری شیرپێدان ئەوا لەوانەیە کرداری بەرگری کردنی سك پڕی کەم ببێتەوە یان هەرەس بهێنێ، وەك

1 —— *Kathleen.G.Averach&Jan Riordan. Breast Feeding&Human Lactation. P: 677.*

ئەو حاڵەتانەی خوارەوە:[1]

1- پشێوی دەروونی ئافرەت و ماندوو بوون وشەکەتی و سەرگەرمی بە کاری دەرەوە ڕێژەی ڕژانی ئۆکسیتۆسین کەم دەبێتەوە.

2- ترس وشەکەتی، کاری قورس دەبنە هۆی کەم بوونەوەی هۆرمۆنی پرۆلاکتین، لەگەڵ زیاد بوونی ئاستی ئەو هۆرمۆنەی کە وادەکات ڕژانی پرۆلاکتین بوەستێ (العامل المثبط لبرولاكتين-Prolactin inhibiting factor ).

3- پێویستە منداڵ ڕاستەوخۆ دوای لە دایك بوون شیری دایك بخوات، چونکە کرداری مژینی مەمك ڕێژەی هۆرمەنەکانی بەرپرسن لە شیردروست کردن وبەرهەم هێنان وشیرهاتنە دەرەوە زیاد دەکات.

4- بەکارهێنانی مەمکدان (واقية حلمة الثدي- Nipple shield) بڕی بەرهەم هێنانی شیر کەم دەکاتەوە.

5- پیادە نەکردنی بەرنامەی شیرپێدانی منداڵ بە شێوەیەکی زانستی کاردەکاتە سەر کاری هۆرمۆنەکان وپشێوی تێکەوتنیان. پێویستە بە گوێرەی پێویستی منداڵەکە شیر بدرێت، نەوەك بە گوێرەی ئارەزوو کاتی ئافرەتەکە.

6- سوور بوونەوەو لەت بوونی پێستەی گۆی مەمك کاردەکەنە سەر کرداری مژین، کەم بوونەوەی هۆرمۆنەکان.

ئەگەر کرداری شیر پێدان بە شێوەیەکی زانستی ڕێك پیادە بکرێت، ئەوا ئافرەت دەتوانێت بە ڕێژەیەکی سەدی بەرز دوور بکەوێتەوە لە سك پڕی بەبێ بەکار هێنانی هۆکارەکانی بەربەستکاری.

بەڵام ئافرەتانی سەردەم چۆن دەتوانن ئەو ڕێنماییانە پیادە بکەن، بەهۆی چوونە دەرەوەیان بۆ کار کردن، تووش بوونیان بە ماندوو بوونی جەستەیی ودەروونی وشەکەتی، دوور کەوتنەوەیان لە منداڵ بۆ ماوەیەکی درێژ، کوێیان لە

---

*1- Stuart.Combell & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 5253,150-152.*

*Lawrence R.A. Breast feading. P: 66,72,212,213-*

گریانی جگەر گۆشەکەیان نابێت، چاویان لەو فرمێسکە خڕو جوانەکانیان نیە کە دەڕژێتە سەرڕوومەتە ناسکەکەی، بێجگە لەوەی زۆربەیان مەمکدانی تەسك بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی بە دیمەنێکی جوان دەرکەون لە نێوان دۆست ودەستە خوشکەکان.

لەوانەیە یەکێك پرسیار بکات وبڵێ: ئەگەر شیری دایك زیاد بکات بە هۆی بیر کردنەوەی ئافرەت لە منداڵەکەی، کەواتە ئەوە شتێکی چاکە بۆ ئەو ئافرەتانەی لە دەرەوە کار دەکەن، ئافرەت لە شوێنی کارکردنیەتی وبیری منداڵەکەی دەکات و شیری زیاد دەبێت. بەڵێ ئەوە شتێکی ڕاستە. بەڵام زیاد بوونی شیری دایك بۆماوەیەك ومنداڵەکە هەڵ نەستا بە کرداری مژین، ئەوا ئەو شیرە دەمێنێتەو مەمك تووشی ئازار دەکات ونەگەری ئەوەشی لێدەکرێت کە تووشی هەوکردنی مەمك بێت، هەروەها دەبێتە هۆی کەم بەرهەم هێنانی شیر لە دواڕۆژ بەهۆی بەردەمی دووری دایك لە منداڵەکەی.

ئەگەر ئافرەت شیری دا منداڵەکەی ولەهەمان کاتدا سك پڕی تووش بوو، ئایا چی ڕوودەدات؟

لە ئەسمای کچی زەیدﷺ[1] دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتیﷺ:((منداڵی خۆتان مەکوژن بەنهێنی چونکە غیلە لەناو فارسەکان هەیە، بۆیە لە کاتی سواری ئەسپدا دەکەون)) .(( لا تقتلوا أولادكم سرّاً فإن الغيلة يدرك الفارس فَيُدَعثِرُهُ* عن فرسه)).[2]

لە کتێبی (عون المعبود شرح سنن أبي داود): ئەگەر ئافرەت شیری دا منداڵەکەی، لە هەمان کاتدا سکی پڕ بوو ئەوا شیرەکەی تێکدەچێ، ئەوەش کاردەکاتە سەر جەستەو دەروونی منداڵەکە، ئەو کاریگەریە دەمێنێ تاوەکو تەمەنی پێگەشتن وسەرووتریش، لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە ڕادەکات ودۆڕاوە کاتی

---

1ــ أسماء بنت زيد بن الخطاب للعدوي: یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە فەرموودەی گێڕاووەتەوە، لە عبد الله ی کوڕی حەنزەلەی گێڕاوەتەوە، عبد الله ی کوڕی عومەریشﷺ لەوی گێڕاوەتەوە. ئیبن حەببان دەڵێ: هاوەڵەکانە، هەندێك دەڵێن تابیعیە. كحالة، أعلام النساء، 43/1.

2ــ مسند الإمام أحمد الرقم:10، 441/27661،و الرقم:27633 .* يدعثره: دەکەوێ و دەمرێ

ململانێ، ئەوەش بە هۆی غیلەیە.[1]

لە ڕوانگەی پزیشکیەوە، سك پڕی وشیردان پەسەند نیە لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

1- کەم بوونەوەی بڕی شیرەکە، ئەوەش منداڵ تووشی بەد خۆراکی دەکات، بەمەش منداڵێکی بێ هێزو لاواز دەبێت، یان منداڵەکە لە شیر دەکرێتەوە پێش تەواو کردنی دوو ساڵ، بەمەش منداڵ لە شیری دایك بێ بەش دەبێت.[2]

2- بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکان تامی شیرەکە بەرەو تاڵی دەڕوات، بەمەش منداڵە زووتر لە شیر دەکرێتەوە.[3]

3- دابەزینی ڕێژەی شەکری لاکتوز لە ناو شیرەکە، دەبێتە هۆی دابەزینی بڕی ئەو ووزەیەی کە شیرەکە دەیبەخشێ، بەمەش گەشەی منداڵەکە دوا دەکەوێت.[4]

ئەو گۆڕانکاریانەی ناو شیر وا دەکات کە ئەو شیرە نەبێتە خۆراکێکی بنچینەیی تەواو بۆ منداڵەکە، بەمەش منداڵێکی لاوازو جەستە بێ هێز دەبێت.[5]

ئەو خاڵانەی باسمان کردن دەربارەی ئەو گۆڕانکاریانەی ناو شیری ئافرەت ڕوودەدات ئەگەر سك پڕی تووش بوو، پێش چەند ساڵێك دۆزراوەتەو سەلمێنراوە کەوا لە جیاتی سوود هەندێ زیانیشی هەیە، بەڵام پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ ئەو ڕاستەی بە ئێمە گوتوە لە ڕوانگەی فەرموودەکانی، کەواتە بەرنامەو پەیڕەو یاساکانی ژیانی ئێمە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە بە 1430 ساڵ لە پێش بەرنامەکانی تری دەستکردە، هەموو بەندەکانیشی لەگەڵ زانست دەڕواو هیچ بەرەنگاریەکیش لە نێوانیان نیە، هەرچەندە زانستیش پێش دەکەوێ زیاتر ئەو ڕاستیانە ڕوون

---

1ـ العظيم آبادي، أبو الطيب محمد شمس الحق، عون المعبود شرح سنن أبي داود مع شرح الحافظ ابن القيم الجوزية، 364/10.

2 _ *Kathleen.G.Averach&Jan.Breast Feeding&Human Lactation.P: 332.*

3 _ *Kathleen.G.Averach&Jan. Breast Feeding&Human Lactation.P: 331*

4__ *Campbell.J.R &Marshall.R.T. The Science Of Providing Milk For Man.P: 27*

5 ـ النتير، علي، الرضاعة الطبيعية، ص138.

دەبنەوە. بۆيە ئێمە پێویستمان بە هیچ بەرنامەیەکی تر نابێ لە هەموو بوارەکانی ژیان، هەردەم لەپێشەنگی گەلانی جیهانیش دەبین ئەگەر ڕاست گۆبین لەگەڵ خواو بەرنامەکەی.

## 2- چارەسەری کێشە ئابووریەکان (الدواعي الاقتصادية)

کێشەی ئابووری لە کەمی سەرچاوەکان نیە، سەرچاوەکان زۆرن، بەڵام قەیران و کێشەکە لە زوڵمی ئادەمیزاد وبێ باوەڕی ودان نەهێنان بە نیعمەتەکانی خودایە. هەر بۆیە ئیسلام بەرپەچی ئەو بیردۆزانە دەداتەوە کە داکۆکی لەسەر کەمی سەرچاوەو زۆری ژمارەی دانیشتوان دەکەن، چونکە خوای گەورە هەموو زەوی وئاسمانی بۆ ئادەمیزاد ڕەخساندووە کە تیایدا بگەڕێ، شتە شاراوەکان وشوێنە نادیارەکانی بدۆزێتەوە بەهۆی ئەو زانست و زانیاریەی پێی بەخشیوون. ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الجاثية:13.

زەوی بەو بچوکیەی خۆی تاوەکو ئێستا زۆر شوێنی هەیە لە ووشکایی وناو زەریاکان هەر نەدۆزراوەتەوە، یان دۆزراوەتەوە بەڵام سوودی لێ وەرنەگیراوە. هەرچەندە زانستیش بەرەو پێشەوە دەڕوات دۆزینەوە زیاتر دەبێت وسەرچاوەکان باشترو زۆرتر سوودی لێ وەردەگیرێ. ﴿سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ فصلت: 53.

ئەوانەی بانگەشەی بۆ دیاردەی دیاری کردنی نەوەکان دەکەن، تەنها بیر لە یەك خاڵ دەکەنەوە، ئەویش ئەوەیە، کە سەرچاوە کەمەو ئەوانەی لە دایك دەبن خواردن بەشیان ناکات، بیر لەوە ناکەنەوە ئەوانە کار دەکەن و سەرچاوەکان بەکار دەهێنن و بەرهەم زیاد دەکەن.

هەروەك دکتۆر باجوری لە کتێبەکەیدا ئاماژە بە ئەڵمانیا دەکات ودەڵێ: لە ساڵی 1880 ژمارەی دانیشتوانی ئەڵمانیا 45 ملیون کەس بووە، لەگەڵ ئەوەشدا

لە تەنگژەیەکی ئابووری دا دەژیا، زۆریان کۆچیان کرد بۆ دەرەوەی وولات، بەلام لە ساڵی 1914 ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە 68 ملیۆن لە جیاتی ئەوەی تووشی نەهامەتی وگرانی بێت، بە پێچەوانەوە باری ئابووری زۆر گەشەی سەندو بەرهەم و داهاتی 10 هێندەی جاران زیادی کرد. تاوەکو ناچار بوون لەدەرەوەی وولات کریکاریان دەهێنا. ژمارەی کرێکارە هاوردەکان لە ساڵی 1900 گەیشتە 800 هەزار کەس ولە ساڵی 1910 گەیشتە ملیۆنەك و300 هەزار کەس. هەروەها ئەڵمانیا تاوەکو ئێستا 10 ملیۆن منداڵی زیاد بووە، 12 ملیون ونیو خەڵکی کۆچبەری بۆ هاتووە، ژمارەی دانیشتوانی لە 100 ملیۆن زیاترە، 6 ملیۆن و نیو پیریش خانەنشین کراوە.

لەگەڵ ئەو هەموو زیاد بوونەی ژمارەی دانیشتوان، ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشەوە دەچێت لە بواری ئابووری وبازرگانی، لە جیاتی ئەوەی هاواری لێ هەڵسێ لەبەر برسیەتی، کێشەی کەمی کریکاری هەیە، هەروەك لە زۆربەی وولاتانی پێشکەوتوو هەمان کێشەیان هەیە. [1]

ئەوانەی بانگەشەی دیاری کردنی نەوەکان دەکەن ئەو بیانوانە دەهێننە پێشەوە:

1- ترسی گرانی وقات وقڕی لە داهاتوودا بەهۆی زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی.

2- ترسان لە کەم بوون وپەککەوتن لە خەرجی(عجـز الانفـاق) پێویست بۆ نەوەکانی دواڕۆژ.

---

1ـ الباجوري، جمال محمد ، المرأة في الفكر الإسلامي، 23/2.

## وەڵامدانەوەی ئەو دوو خاڵە:

1. ترسی گرانی وقات وقڕی لە داهاتوودا بەهۆی زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی.

ئەو بیرۆزە کورت بینە، چونکە تەماشای زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان دەکات، بەڵام تەماشای زیاد بوونی بەرهەم هێنان بە هۆی پێشکەوتنی زانست و زانیاری وداهێنانیان نەکردووە. ئادەمیزاد هەزارەها ساڵە لەسەر زەوی دەژیت، بەڵام نەیان زانیوە کە لە ژێر ئەو زەویەی کە لەسەری دەژین بە ملیارەها تەن زێری ڕەشی (نەوت) تیایە کە بۆتە هۆکارێکی سەرەکی ژیانی ئێستامان.

تاوەکو ئێستا زۆر نیعمەتی خوا هەیە شاراوەیە، لەوانەیە ئەو کاتەی کە پێویستمان بوو، خوای گەورە مێشکی ئادەمیزادان ئاڕاستەی دەکات، بەلام ئێستا دەرکی نابەن. خوای گەورە فەرموویە: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾القصص:68.

بۆیە پێویستە بە ڕەشبینانە لەو بابەتە نەڕوانین، چونکە ئەوانەی بانگەشەی ئەو بیرۆزانە دەکەن بەڵگەی زانستی تەواویان نیە لەو بارەیەوە تەنها تێڕوانینێکی ڕەشبینانەیە.

ئایا ئەوانە گەرەنتی دەدەن کەوا مێشکی زانایان چی تر ناتوانن داهێنان بکەن، سەرچاوەی نوێی تر بدۆزنەوە، یان زەوی شتی شاراوەی تری تیا نیە. ئەگەر ئەو دوو خاڵەیان دۆکیومینت کردووە ئەوکات دەتوانن بڵێن بانگەشەکەمان گشتگیرو جیهانیە.

پێویستە ئەوانە ئەوەش بزانن کەوا ڕۆژانە زانایان هەوڵی دۆزینەوەی سەرچاوەی نوێی ووزە دەدەن، چاکسازی کشتوکاڵی، هۆکاری بەرهەم هێنان و پیشەسازی تاوەکو تەریب بێت لەگەڵ زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوان.

2- ترسان لە کەم بوون وپەککەوتن لە خەرجی(عجز الانفاق) پێویست بۆ نەوەکانی دواڕۆژ.

هەندێ کەس دەترسن لەوەی چۆن ژیانی منداڵەکانیان دابین بکەن لە دوارۆژ، تەمەنی منداڵی تاوەکو دەرچوون لە زانکۆ، دامەزراندن لە فەرمانگەیەك ودابین کردنی ژیانی هاوسەرێتی. ئەوانەی داهاتیان کەمە زیاتر بیر لەو شتانە دەکەنەوە، بۆیە هەرکات دوو تا سێ منداڵیان دەبوو، بیریان لە رێکخستنی ژمارەی نەوەکانیان دەکەن. بەلام ئەوانە بیر لەوە ناکەنەوە کەوا ئەو منداڵانەش کار دەکەن، خوای گەورەش هەر منداڵێك دەبێت رزق وڕۆزی خۆی لەگەڵ دەنێرێ. هەروەها ئەوانە بناغەی بڕیارەکانیان لەسەر شتی گومانایە، چونکە نازانرێ تا ئەو کاتی ئەو منداڵە گەورە دەبێ چ گۆڕانکاری وپێشکەوتن ڕوودەدات.[1]

خوای گەورە بۆ ئوممەتی ئیسلامی زەویەکی بە پیت وبەرەکەتی داناوە، خێراتی زۆری تیایە کە لە ژماردن نایەت، ئەوەش بە هۆی دوعای باوکی پێغەمبەران بووە، ئیبراهیم ﷺ، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ البقرة: 126.

گەورەترین نیعمەت بریتیە لە زێری ڕەش، هەروەها زەویەکی بە پیت وبەرەکەت بۆ کشتوکاڵ، بوونی ژمارەیەکی زۆری دەستی کارکردن (الأيدي العاملة)، بەلام ئەوەی گرنگە تاوەکو زیاتر سوود وەربگرین پێویستە لەسەر سەرکردەکان، ئەوانەی فەرمانی موسوڵمانانیان بەدەستە کە ئەو خێراتە بە شێوەیەکی زانستیانەو جوان بەکاربهێنن، بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش بکرێت بەسەر خەلکەکەی. هەروەها پیلانی درێژ خایەن دابڕێژن بۆ بوژاندنەوەی وولات وگەشە پێدان وئاوەدان کردنەوەی، دوور لە بەفیڕۆدانی سامانی وولات لەشتی بێ سوودی کاتی، ڕابواردن وبەدڕەوشتی، هیچ تاکێك پێویستی بەوە نەدەبوو کە ڕێگەی بەربەستکاری بگرێتەبەر بۆ دیاری کردنی ژمارەی نەوەکانی.

پێویستە موسڵمان باوەڕێکی تەواوی هەبێ بەوەی کە خوای گەورە ڕزق وڕۆزی دەبەخشێ، چونکە خاوەن هێزو دەسەلاتە﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾الذاريات: 22.

---

1 ـ النعيمي، محمود ناظم، موقف العلم والإسلام من تحديد نسل الأمة، بحث منشور في الانترنيت، 2007م.

هەروەها ڕێگەیەكی تریش هەیە بۆ زۆر بوونی سەرچاوەكانی ئابووری ئەویش بریتیە لە تەقوای خواو پاڕانەو تۆبە كردن، هەروەك پێغەمبەری خوانوح(علیە السلام)، داوای كردووە.﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ ﴾ نوح: 11،10،9.

بەڵام ئەگەر یەكێك هەژاری بۆ نوسرابوو لەقەدەری خوا، ئەوا دەتوانێ بەربەست بكات، چونكە دەكەوێتە دەروازەی پێویستیەكان( الحاجات تنزل منزلة الضرورات في إباحة المحظورات).[1]

ئاینی ئیسلام لەسەر باوكانی واجب كردووە كەوا بژێوی منداڵەكانی دابین بكات، لە شیر پێدان وپۆشاك وشوێن، فێركردنی زانستی دین ودونیا.

ئامانجی سەرەكی ژن هێنان تەنها زۆر كردنی ژمارەی منداڵ نیە، هەرچەندە گەر لاوازو بێ هێزیش بن، بەڵكو گرنگ ئەوەیە كەوا توانای ماددی باوك بگاتە ئەو ئاستەی كە بتوانێ پەروەردە وچاودێریان بكات تاوەكو بتوانن بە لێپرسراویەتی خۆیان هەڵسن.[2] هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( ئیمانداری بەهێز باشترو چاكترە لە ئیمانداری لاوازو بێ هێز، هەموویان هەر خێرو چاكن)). ((المؤمن القوي خير وأفضل وأحب إلى الله عز وجل من المؤمن الضعيف وفي كل خير)).[3]

كەمی دەرامەت و داهاتی خێزان زیان بە ئافرەت و كۆرپەكە و منداڵەكانی تر دەگەیەنێ بەهۆی كەمی خواردنی پێویست وڤیتامینەكان، یان لە كاتی نەخۆشی ناتوانێ چارەسەری پێویست دابین بكات، ئەوانەش هۆكارن بۆ ئەوەی كێشەو پشێوی بكەوێتە ناو خێزان، لەو حاڵەتانەدا ئەگەر كۆمەڵگە موسڵمان بوون ئەوا بە هۆی زەكات وخێر دەتوانن هاوكاریان بكەن وباری ئابووریان ڕاست بكەنەوە، ئەگەر بەم شێوەیەش نەبوو ئەوا ئەو خێزانە دەتوانێ بەربەستی كاتی بكات. هەروەك یوسف قەرزاوی دەڵێ: لەترسی تووش بوون بە سەختێتی(حرج) ماددی دونیایی

1 ــ خلاف، عبد الوهاب، علم أصول الفقه، ص237.

2ــ الشرباصي، يسألونك في الدين والحياة، 242/1.

3ــ مسند إمام أحمد،8837/3. وصحيح مسلم، بشرح النووي،250/16. وسنن ابن ماجة،31/1.

یان حەرەجی ئاینی، بکەوێتە ناو شتێکی گوماناوی قەدەغەکراو، یان تاوانێک بکات لە پێناوی دابین کردنی بژێوی منداڵەکانی.[1] خوای گەورەش لە ئاینی ئیسلام بارگرانی و کێشە کەوتنە ناو بۆمان دانەناوە هەروەك دەفەرمووێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ البقرة: 158 .

دەفەرمووێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾المائدة: 6.

هەر ئوممەتێك ونەتەوەیەك وکۆمەڵگەیەك ڕێژەی منداڵبوونی کەمتر بێ یان یەکسانی بێت لەگەڵ ڕێژەی مردنی تاکەکانی، ئەوا ئوممەتێکی خەسارەتمەندە، هەر کارەساتێکی تووش بێت وەك شەڕ، گرانی، برسیەتی، کارەساتی سروشتی ئەوا نیشانە سەرەتاکانی لەناوچوونی دیار دەکەوێت، لە کاتێکی نزیك یان دوور.

3- چارەسەری کێشە کۆمەلایەتی وپەروەردەییەکان

هەر کەسێك (نێر- مێ) سەربەست وئازادە چی دەکات یان بڕیار دەدات بۆ ژیانی خۆی، بەڵام نابێ ئەو ئازادیە مافی کۆمەڵگەو خەڵکانی تر پێ شێل بکات، چونکە ئازادی تاك کۆتایی دێت کاتێ ئازادی یەکی تر تێکدەدرێ، ئەگەر ئەو تاکە خۆی بە یەکێك لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە دادەنێ.

هەموو تاکێك لە کۆمەڵگە ئەرك وفەرمانی لەسەرە ولە هەمان کاتیشدا مافی هەیە، بۆیە نا بێت تەنها بەرژەوەندی خۆی ڕەچاو بکات، بەبێ ڕەچاو کردنی بەرژەوەندیە باڵاکانی کۆمەڵگەو وڵات.[2]

مێژوو نووس سورکین دەڵێ: ئەگەر هەر نەتەوەیەك بە دەم بانگەوازی شەهوەو ئارەزووەکانی نەفسی هەنگاوی هەڵگرت، خۆی تەنها خەریکی کاری جینسی و شەهوە کرد، ئەوا مەحالە بیر لە منداڵ ونەوەکانی دوارۆژ بکاتەوە، چونکە وا دەزانێ ئەوانە بەربەستن لەبەر دەم تێر کردنی ئارەزووەکانی وگەیشتنە ئامانجە ئابووریەکانی. بۆیە دیاری کردنی نەوەکان بەلای منەوە دژایەتی فیترەتە، چونکە

---

1- القرضاوي، الحلال والحرام، ص192.

2- نورالدين عتر، ماذا عن المرأة، صفحات متفرقة.

ئەوانە هەموو هۆکارێکی بەربەستکاری ولەبارچوون دەگرنە بەر بۆ گەیشتنە ئامانجەکانیان، ئەمەش نەتەوە بەرەو هەڵدێرو خۆ کوشتن دەبات. [1]

لە کتێبی (فتح القدیر شرح الهدایة) حەنەفیەکان دا هاتووە: جائیزە کۆمەڵگە بەگشتی بەربەستکاری بکات گەر فەسادو بەدڕەوشتی گەیشتە ئەو ئاستەی خەڵك نەتوانێت پەروەردەی منداڵەکانی بکات بۆ ئاین وبۆ دونیا. یان ئافرەتەکە بەدڕەوشت بوو، پیاوەکەش دەیویست دەستی لێ بەردات. [2]

بەهەمان شێوە حەنەفیەکان دەڵێن گەر لە ناو بێ باوەڕانی شەڕ خوازیش بوون ئەوا هەمان حوکمی هەیە. [3]

چارەسەری ئەو کێشەیە بەوە دەکرێت کە پەروەردەیەکی دروستی ئیسلامی منداڵەکان بکرێت، تاوەکو خێزانێکی موسڵمان دروست بکەن، هەوڵ بدرێت موسڵمانان لەناو وڵاتی بێ باوەڕان نەمێنن وبگەڕێنەوە، بە تایبەتی ئەوانەی کاری تەندروستی وزانست وەرگرتنیان نیە.

## پوختە بابەتەکە ئەوەیە:

ئەگەر هەر خێزانێك ڕووبە ڕووی کێشەیەکی تەندروستی، ئابووری، کۆمەڵایەتی وابوو نەیان توانی چارەسەری بکەن پاش هەوڵ وتێکۆشانێکی زۆر، ئەوا بۆیان هەیە بە شێوەیەکی کاتی بەربەستکاری بکەن تاوەکو چارەسەری کێشەکەیان دەکرێت وخوای گەورە دەرگای خێریان بۆ دەکاتەوە. ئەوەش بە مەرجێ گشتگیری نەکرێ بۆ سەر کۆمەڵگە. ئەو ڕێگە پێدانەش لەو دەروازەی فیقهیەوەیە: هەڵبژاردنی سووکترین زیان لە نێوان دوو زیاندا (ارتکاب أخف الضررين لاتقاء أشدهما)، هەروەها لە دەروازەی پێویستیەکان وا دەکەن شتە ڕێگە پێ نەدراوەکان، ڕێگەیان

---

1ـ النسيمي، محمود ناظم، موقف العلم والإسلام من تحديد نسل الأمة، بحث منشور في انترنيت، 2007م.

2 ـ ابن الهمام، فتح القدير شرح الهداية، 2/494.

3ـ ابن عابدين، رد المحتار، 3/176.

پێ بدریت بۆ ئەنجامدانی (الضرورات تبیح المحظـورات) هەر کات هۆکارەکان نەمان ئەوا پاساوی بەربەستکاری نامینێ، چونکە پێویستیەکان بە هێندی خۆی دادەنرێ (الضرورات تقدر بقدرها)، واتە حوکمی ڕێگەپێدان (الرخـصة) بەتاڵ دەبێتەوە هەر کات هۆکارەکانی نەمان(أن أحكام الرخص تبطل إذا زالت أسبابها)[1]

1 ـ خلاف، عبد الوهاب، علم أصول الفقه، ص236.

# بەشی چوارەم

# لەبارچوون ولەباربردن

# ( الإسقاط والإجهاض )

باسی یەکەم: واتای لەبارچوون وجۆرەکانی

باسی دووەم: حوکمی لەباربردن لە ئیسلامدا

باسی سێیەم: چارەسەری کێشەی لەباربردن.

# باسی یەکەم

## واتای لەبارچوون وجۆرەکانی

## (الإسقاط- الإجهاض- Abortion)

بەندی یەکەم: واتای لەبارچوون و لەباربردن

بەندی دووەم: جۆرەکانی لەبارچوون

برگەی یەکەم: لەبارچوونی ئاسایی

برگەی دووەم: هۆیەکانی لەبارچوونی ئاسایی

برگەی سێیەم: جۆرەکانی لەبارچوونی ئاسایی

برگەی چوارەم: لەباربردنی چارەسەری

برگەی پێنجەم: لەباربردنی کۆمەڵایەتی

بەندی سێیەم: کاریگەریە لابەلاکانی لەباربردن

برگەی یەکەم: کاریگەریە هەنوکەیەکان

برگەی دووەم: کاریگەریە دواکەوتوەکان

برگەی سێیەم: کاریگەریە درێژخایەنەکان

بەندی چوارەم: هۆیەکانی مردن لەکاتی لەباربردن

## باسی یەکەم: واتای لەبارچوون وجۆرەکانی

### بەندی یەکەم: واتای لەبارچوون و لەباربردن

واتای زمانی: جهض: (أجهضت الناقة إجهاضاً. فهي مجهض: کۆرپەلەکەی فڕەدا پێش تەواو بوون. مجاهیض. الجهیض: ئەو کۆرپەلەیە کە تەواو خولقاوەو ڕوحی تیایەو بەڵام توانای ژیانی نیە. أجْهَضَت: واتە کۆرپەڵەکەی فڕەدا پێش تەواو بوونی خولقانی. والمجْهَض: بەوە دەڵێن کە خولقانی تەواو نەبووە.[1]

(وسَقَطَ: کۆرپەلەکە لە سکی دایکی کەوت، ئافرەتەکە کۆرپەلەکەی کەوت. السِقْطُ: ئەو منداڵەی لە سکی دایکی بکەوێ پێش تەواو بوونی خولقانی.[2]

واتای زاراوەیی:(ئەوەی ئافرەت فڕەی دەدات پێش تەواوبوونی کرداری خولقانی کۆرپەلە، یان تەواو خولقاوەو مردووە، یان ماوەکەی تەواو نەبووە، جا ئەو فڕەدانە ئاسایی بێت (خۆنەویست) یان بەهۆی یەکێکەوە بێت.[3]

لە زانستی پزیشکیدا بریتیە لە: هاتنە خوارەوەی پێکهاتەکانی سك پڕی پێش هەفتەی 28 یەم.[4]

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 408/2. والزبيدي، تاج العروس، 16/6.

2 ـ ابن منظور، لسان العرب، 293/6.

3ـ الزبيدي، تاج العروس، 16/6.

*4—Stanly.G.Clayton et al. Gynaecology by ten teachers. P: 275.*

*-James R.Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 143.*

## بەندی دووەم: جۆرەکانی لەبارچوون (أنواع الإجهاض)

### برگەی یەکەم: لەبارچوونی ئاسایی (الإجهاض التلقائي)

تەنها بەو جۆرە لەبارچوونە دەڵێن لەبارچوون، چونکە لەخۆوە ڕوو دەدات ودەستی کەسی تیا نیە. بە گشت جۆرەکانی تری لەبارچوونیش دەڵێن لەباربردن چونکە خۆویستەو بەدەستی خەڵکانی تریش ئەنجام دەدرێت.

ڕێژەی ئەو جۆرە لەبارچوونە دەگاتە 50٪ لە کۆی گشتی لەبارچوونەکان. زۆربەی ئەو جۆرە لەبارچوونانە لە نێوان هەفتەی 4-13 ڕوودەدات، واتە (سێ مانگی یەکەمی سك پڕی- First Trimester) بەمەش منداڵدان هەموو ئەوپێکهاتانەی کە تیایەتی فڕێی دەداتە دەرەوە لەگەڵ خوێن بینین. بەڵام لەبارچوون لە مانگی چوارەم بەسەرەوە ) واتە سێ مانگی دووەمی سك پڕی- (Second Trimester) پێی دەڵێن( امـــلاص- Miscarriage ) کە لە منداڵبوونی ئاسایی دەچێت، بەوەی پێشەکی پەردەی ئەمنیۆنی دەتەقێت وکۆرپەلەکە دێتە دەرەوە دوایی وێڵاش. ئەو جۆرە لەبارچوونە بەشێوەیەکی سەرەکی ڕوودەدات لەو کۆرپەلانەی شێواون بەهۆکاری بۆماوەیی.[1]

پێغەمبەری پێشەوامانﷺ ئاماژەی بەو جۆرە لەبارچوونە کردووە لە فەرموودەکانی هەروەك ئیبن مەسعودﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە: ((ئەو کاتەی هێلکەی پیتێنراو خۆی بە دیواری منداڵدان هەڵدەواسێ، خوای گەورە مەلائیکەتێکی بۆ ڕەوانە دەکات، دەڵێ: ئەی پەروەردگار بکاتە باری خولقاندن یان نا؟ ئەگەر فەرمووی نەکاتە خولقاندن ئەوا منداڵدان ئەو پارچە گۆشتە فڕێی دەداتە دەرەوە. ئەگەر ووتی: بکاتە خولقاندن، ئەوا مەلائیکەتەکە دەڵێ: ئەی خوایە، دڵشادە یان ماندوو شەقی یە؟ ئایا ئەجەلی کەیە؟ چۆن ولە کوێ دەمرێت؟)) ((إذا وقعت النطفة

---

1 _Stuart &Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 277.

في الرحم بعث الله ملكاً فقال يا ربّ مخلّقة أو غير مخلّقة فإن قال غير مخلّقة مجّها الأرحام دماً. وإن قيل مخلّقة قال: أي ربّ شقي أم سعيد؟ ما الأجل؟ ما الأثر وبأي أرض تموت؟)).[1]

لە کتێبی (فتح الباري) لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیەدا هاتووە کە ئیبن مەسعودﷺ دەڵێ: کۆرپەلەی نەخولقێنراو منداڵدان فڕێی دەداتە دەرەوە، ئەگەر خولقێنراو بوو ئەوا فریشتەکە دەڵێ: ئەی خوایە سیفەتەکانی چی یە؟ [2]

ئیبن عەباس دەڵێﷺ : المخلقة: ئەوەی کە زیندووە، وغير مخلقة: ئەوەی کە لەباردەچێت.[3]

## بڕگەی دووەم: هۆیەکانی لەبارچوونی ئاسایی (أسباب الإجهاض التلقائي)[4]

1- پشێوی ونادروستی لە هێلکەی پیتێنراو (Malformation of Zygote).
ئەو هۆیە ڕێژەی 50%- 60% هەموو هۆیەکانی ئەم جۆرە لەبارچوونە پێکدەهێنێ، لە ئەنجامی هەڵبەزینی بۆماوەکانە لە شوێنی خۆی بۆ شوێنێکی تر. ئەگەر کۆرپەلەکە لەباریش نەچێت ئەوا دوای لەدایک بوون دەبینین شێوەو ناکارو ئەندامەکانی شێواوە.

2- پێشوازی نەکران لە کۆرپەلە لەناو منداڵدان، بەهۆی پشێویەك لە کۆئەندامی بەرگری لەش (رفض استقبال الجنين المناعي-Immunological Rejection)، بەمەش منداڵدان پێشوازی لە هێلکەی پیتێنراو ناکات، وەك تەنێکی بێگانەی هەژمار دەکات لەناو جەستەی دایك، بۆیە شەڕی لەگەڵدا دەکات تاوەکو دەیکوژێ و فڕێی دەداتە دەرەوە.

---

1ـ البخاري كتاب بدأ الخلق، باب: ذكر الملائكة الرقم:3232،3208، 365/6 و 419/1 .
2ـ ابن حجر العسقلاني، فتح الباري،419/1.
3ـ النيسابوري، الحاكم، المستدرك على الصحيحين، 418/2.
4ـ *Stanly.G.Clayton et al. Gynaecology by ten teachers. P: 280-277.*
*- James R.Scott et al. Danforths Obstetric&Gynecology. P: 144-145*
*- Leon Speroff. Clinical Gynecologin Endocrinology&Infertility. P: 535.*
*-Hunter JAA.(2005).Davidsons Principle&Practice of Medicine.P:342-340.*

3- نەخۆشیە گشتیەکانی دایک: وەك نەخۆشی مەلاریا، نەخۆشیە جینسیە گوازراوەکان، وەك فەرەنگی (الزهری- Syphilis)، تای مالتا، بەرزبوونەوەو دابەزینی هۆرمونەکانی رژێنەی دەرەقی، نەخۆشیە درێژ خایەنەکانی گورچیلە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنی توند، بەد خۆراکی.

4- پشێوی لە کۆئەندامی زاوزێی مێینە: هەندێ پشێوی زگماکی لە شێوەو کاری منداڵدان، شێرپەنجە نا ترسناکەکان (أورام الرحم الحميدة- Fibromyomas)، وەرگەڕانی منداڵدان (انقلاب الرحم- Retrovertion)، دڕانی ملی منداڵدان بەهۆی لە دایك بوونە نا ئاساییەکانی پێشوو.

5- کەمی هەندێ لە هۆرمونەکان: بەتایبەتی هۆرمونی پرۆجیسترۆن کە بەهۆرمونی سك پڕی ناسراوە، دیواری منداڵدان ئامادە دەکات بۆ وەرگرتنی هێلکەی پیتێنراو ودروست بوونی قۆناغی هەڵواسراو. زۆربەی پزیشکان لەگەڵ ئەوەن کەوا ئەو هۆرمونە رۆلێکی زۆر گرنگی هەیە، هەرکات ئافرەتێك منداڵی زۆر لەبارچوو (لەبارچوونی دووبارەبۆوە، الإسقاط المتكرر- Repeated) ئەوا دەبێت بیر لەوە بکرێتەوە کە لەوانە بڕی ئەو هۆرمونە دابەزیبێت لە ناو خوێنی ئافرەتەکە.

6- دەرمان: هەندێك دەرمانی پزیشکی هۆکارن بۆ لەبارچوون، لەوانە دەرمانەکانی چارەسەری شێرپەنجە، مەلاریا، لاتە سەریەشان، هەروەها هۆرمونی ئوکسیتۆسین و پرۆستاگلاندین (زۆربەی پزیشکان بەکاری دەهێنن بۆ کرداری لەباربردن، تاوەکو پێکهاتەکان زوو فڕێ بدرێنە دەرەوە).

7- پالەپەستۆیەکی دەرەکی لەسەر سکی ئافرەت: لێدانی توند، کارەساتی ئۆتوموبیل، کەوتنە خوارەوە لەبەرزی، ئەوانە هۆکارن بۆ دابڕانی کۆرپەلە لە منداڵدان وهاتنە خوارەوەی.

8- پشێویەکی دەرونی توند: ترسێکی زۆر کە دەبێتە هۆی گرژبوونەکی توندی ماسولکەکانی منداڵدان وفرێدانی کۆرپەلە.

## برگەی سێیەم: جۆرەکانی لەبارچوونی ئاسایی [1]

**یەکەم: لەبارچوونی هەڕەشە (الإجهاض المهدد- المنذر- Threatened)**

بە هەڕەشە ناو دەبردرێ چونکە ئاگادار دەکاتەوەو هەڕەشە دەکات کە لەوانەیە بێتە لەبارچوون. سەرەتا هەندێك خوێنی کەم دەبینرێ، ئەگەر ئافرەتەکە پشوو بدات وئاسوودە بێت بۆ ماوەی دوو هەفتە ئەوا خوێنەکە دەوەستێ و کۆرپەلەکە دەکەوێتەوە گەشەو هیچ کاریگەری لابەلاشی نابێت.

2- لەبارچوونی گومان لێ نەکراو ( الإجهاض المحتم- Inevitable) بەو ناوە ناونراوە چونکە شتێکی گومان لێ نەکراوە کەوا لەبارچوون ڕوودەدات. هیچ ڕێگەیەکی چارەسەریشی بۆ نیە. نیشانەکانی هاتنە خوارەوەی خوێنەکی زۆری توند، لەوانەیە بەردەوام بێ بۆ ماوەی سێ هەفتە، هاوکات لەگەڵ بوونی ئازار لە خوارەوەی سك وپشت بەهۆی کرانەوەی ملی منداڵدان. ئەگەر منداڵدان هەموو پێکهاتەکەی فڕێ بداتە دەرەوە ئەوا پێی دەڵێن لەبارچوونی تەواو (الإجهاض الكامل- Complete) ، ئەگەر منداڵدان نەی توانی هەموو پێکهاتەکانی ناوەوەی فڕێ بدات ئەوا پێی دەڵێن لەبارچوونی ناتەواو (الإجهاض غير التام- Incomplete)، لەو کاتەدا پێویستە هەموو ئەو پاشماوانە دەربهێنرێ، ئەگەر دەرنەهێنرا ئەوا بۆگەن دەکات وهەوکردنیشی دێتەپاڵ، ئەوکات پێی دەڵێن لەبارچوونی بۆگەن بوو(الإجهاض المنتن-Septic Abortion). ئەو پاشماوانە دەتوانرێ زۆر بەئاسانی دەربهێنرێ بە نەشتەرگەریەکی سادە کە ناسراوە بە پاککردنەوە ولە لای پزیشکان ناسراوە بە فراوان کردن وسووتان (التوسع والكوى- Dilitation&Curretage)، هەوکردن وبۆگەن بوونەکەش پێویستی بە دەرمانی دژەتەن، واتەدەرمانی دژی میکرۆبەکان هەیە(بالمضادات الحيوية- Antibiotics).

---

1 _ *Stanly.G.Clayton et al. Gynaecology by ten teachers. P : 280-287.*
*-James R.Scott, Danforths. Obstetric& Gynecology. P: 145.*

3- لەبارچوونی شاراوە (الإجهاض المختفي- Missed): ئەو جۆرە لەبارچوونە بەهۆی خوێن بەربوون دروست دەبێت لەناو منداڵدان، بەمەش کۆرپەلە بێ بەش دەبێت لە خواردن ودەمرێت، زۆر جاریش هەیە کۆرپەلەکە دەورە دەدرێت بە ماددەی کلس (کالیسیوم) پاش مردنی بۆ ماوەیەکی زۆر. دوایی منداڵدان خۆی فرێی دەداتە دەرەوە، یان پزیشکان دەریدەهێنن بەهۆی هۆرمونەکانی کە باسمان کردن لەسەرەوە (ئوکسیتۆسین وپرۆستاگلاندین)، یان بەهۆی ئەو نەشتەرگەریەی باسمان کرد (فراوان کردن وسووتان).

4- لەبارچوونی دوبارە بۆوە (الإجهاض المتكرر-Repeated): ئەگەر لەبارچوون دووبارەبۆوە ئەوا لەسەر پزیشك پێویستە بگەڕێ بە دوای هۆیەکانی، چونکە لەوانەیە بە هۆی نەخۆشیەکی درێژخایەن بێ لە دایکەکە، ناتەواوی لە منداڵدان، فراوانی ملی منداڵدان، نەخۆشیەکانی بۆماوەیی لەو کۆرپەلەی هەیە. ئەگەر هەر هیچ هۆکارێکیش نەبوو بۆ ئەو هەموو لەبارچوونانە ئەوا ئەو کات پێی دەڵێن لەبارچوونی عادەتی (الإجهاض المعتاد-Habitual)، لەوکات بیر لە کەمی هۆرمونی پرۆجیسترۆن دەکرێت وەك هۆکارێك بۆ ئەو لەبارچوونە.[1]

ئەو جۆرە لەبارچوونانە بە تاوان دانانرێ وهیچ گوناهو سزایێکی لەسەر نیە چونکە هیچیان بە ویستی ئافرەتەکە نین.

## بڕگەی چوارەم: لەباربردنی چارەسەری

(الإجهاض العلاجي-إنهاء الحمل- Termination of Pregnancy ).[2]

پزیشکەکان چەند مەرجێکیان داناوە پێش ئەوەی بڕیاری لەباربردنی چارەسەری بدەن، لەو مەرجانە:

1- واژۆ کردنی بڕیارەکە لەلایەن دوو پزیشك، بەمەرجێ لە کەس وکارو خزمی

1 _James R, Danforths. Obstetric&Gynecology. P: 147.
2 _Stanly.G.Clayton et al. Gynaecology by ten teachers.P:270,316-320.
- James R, Danforths. Obstetric& Gynecology. P: 571-576 .
- Vanlunsen R.H.W. Contraception Choice& Realities. P: 26-22.

دایکەکە نەبن.

2- ئامانجی سەرەکی لەباربردنەکە بۆ ڕزگار کردنی دایکەکە بێت.

3- پارێزگاری وبەرگری کردن بێت بۆ دایکەکە، تاوەکو تووشی پشێوی جەستەیی وعەقلی نەبێت.

4- بەرگری کردن بێت بۆ ئەو منداڵانەی ناو ئەو خێزانە- کە پێشتر لە دایك بوونە- تاوەکو تووشیان بە پشێوی جەستەیی وعەقلی نەبێت.

5- پارێزگاری وبەرگری کردن بێت بۆ کۆرپەلەکە، تاوەکو تووشی پشێوی جەستەیی وعەقلی نەبێت.

کرداری لەباربردنی چارەسەری بەچەند ڕێگەیەکی جیا ئەنجام دەدرێت، کە بەندە بە تەمەنی کۆرپەلەکە، لەو ڕێگایانەش:

یەکەم: ئەگەر تەمەنی کۆرپەلەکە لە 8 هەفتە کەمتر بوو، ئەوا دەتوانین هەموو پێکهاتەکانی ناو منداڵدان دەربهێنین بەهۆی کانیولا (قُصیبة- Cannula) وسرنجی 50 ملم³.

دووەم: ئەگەر کۆرپەلە تەمەنی 12 هەفتە بێت، ئەو کات کرداری مژین بەکار دەهێنرێ (عملیة المص- Suction).

لەکاریگەرە لابەلاکانی ئەو دوو جۆرە ڕێگانە:

أ- سەرنەکەوتنی کرداری لەباربردن (فشل الإجهاض).

ب- خوێن بەربوون لەناو منداڵدان.

ج- دیاردەی هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ، زێ، ملی منداڵدان، منداڵدان.

د- بریندار کردنی کۆئەندامی زاوزێ.

سێیەم: پێدانی ئافرەتەکە برێك لە هۆرمۆنی پرۆستاگلاندین( PGF2 - PGFE2) بە ڕێگەی خوێن هێنەر، ئەوەش پاڵەپەستۆیەکی زۆر دروست دەکات لە ناو منداڵدان، وا دەکات پێکهاتەکانی ناو منداڵدان فرێ بداتە دەرەوە.

**لەکاریگەرە لابەلاکانی ئەو ڕێگایە:**

أ- ڕشانەوە

ب- سکچوون

ج- دڕانی ملی منداڵدان

د- ئەو کردارە ماوەی یەك ڕۆژی دەوێت، لەگەڵ ئازارێکی زۆر.

چوارەم: ئەگەر کۆرپەلە لە تەمەنی 14 هەفتەدا بوو: باشترین ڕێگە ئەوەیە گیراوەیەکی خەست بخرێتە ناو ئەو شلەی ئەمنیوتیەی کە دەوروبەری کۆرپەلەی داوە، وەك 200 ملم$^3$ لە گیراوەی خوێی چێشت (ملح الطعام- 20NaCl%).

**لایەنە خراپەکانی ئەو ڕێگایە:**

أ- لەناوبردنی خانەکانی مێشك بەهۆی چڕی زۆری ئەو گیراوەیە.

ب- میز گیران (انقطاع البول-Anurea).

ج- سەرنەکەوتن لە تەواو پاککردنەوەی منداڵدان لە پێکهاتەکانی ناوی. (Incomplete Evacuation).

پێنجەم: نەشتەرگەری قەیسەری (العملیة القیصریة - Caesarean Operation). لەهەموو تەمەنەکانی کۆرپەلە دەتوانرێ ئەنجام بدرێت، نەشتەرگەریەکی خێرایە، بەڵام کاریگەری لابەلای لەوانی تر زیاترە گەر بەجوانی ئەنجام نەدرێت.

## برگەی پێنجەم: لەبارچوونی کۆمەڵایەتی- تاوانباری (الإجهاض الاجتماعي- الجنائي)

بێگومان لەو سەردەمەی ئێستامان لەباربردنی کۆمەڵایەتی زۆر زیاترە لە لەبارچوونی ئاسایی، دەرەنجامی ئەو فەسادە بەربڵاویەو بەد ڕەوشتیەی هەموو چینەکانی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوای گرتۆتەوە.

ئەگەر ڕێگەکانی بەربەستکاری نەبوونایە، ئەوا ڕێژەی لەباربردنی کۆمەڵایەتی زۆر زیاتر دەبوو. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ پێش 1430 ساڵ بەر لە ئێستە باسی ئەو دیاردە بەد ڕەوشتیەی بۆمان گێڕاوەتەوە، بە وەسفێکی زۆر وردو جوان و دەفەرمووێ: ((ڕۆژی دوایی نایەت تاوەکو خەڵکە بەدەکان کە هیچ چاکە ناکەن ولە خراپەش دەست ناپارێزن، هەروەك گیانلەبەران لەسەر شۆستەی جادەو ڕێگەو بانەکان کاری جینسی دەکەن، پیاو دەچێتە لای ئافرەتێك وکاری جینسی خۆی ئەنجام دەدات، پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە لای هاوەڵەکانی ودەست دەکات بە پێکەنین وئەوانیش بەهەمان شێوە پێدەکەنن)). ئەو فەرموودەیە ئیبن عومەر ﷺ دەیگێڕێتەوە:((لا تقوم الساعة إلا على شرار الناس من لا يعرف معروفاً ولا ينكر منكراً ويتهارجون كما تهارج البهائم في الطريق، تمر المرأة بالرجل في الطريق فيقوم إليها فيقضي حاجته منها ثم يرجع إلى أصحابه فيضحك إليهم ويضحكون إليه)). لە ڕوایەتی تردا هاتووە: ((ڕۆژی دوایی نایەت تاوەکو خەڵك وەکو ڕەشە وڵاخ کاری جینسی نەکەن لەسەر ڕێگەو بانەکان)). ((لا تقوم الساعة حتى يتفاسد الناس تفاسد البهائم في الطرق)).[1]

لەباربردنی کۆمەڵایەتی زیانی بۆ ئافرەتەکەو کۆمەڵگە زۆرە، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە کۆرپەلە، کە نەفسی بێ تاوانن بە هیلاك دەدرێت، لەگەڵ ئەو کردارەش ژمارەیەکی زۆر لە دایکان گیانیان لە دەست دەدەن، یان تووشی نەزۆکی، یان کێشەیەکی تەندروستی ڕووبەڕوو دەبێتەوە. چونکە ئەو جۆرە لەباربردنە تاوانی لەگەڵدایە وبەشێوەیەکی نهێنی ئەنجام دەدرێت، لە شوێنی دوور لە مەرجەکانی تەندروستی، بە بەکارهێنانی کەل وپەلی پیس ونامۆ، بەکارهێنانی دەرمانی کلتوری، یان بە هۆی پاڵەستۆی زۆر خستنە سەر سکی ئافرەتەکە، ئەمانەش هەمووی هۆکاری زیان بەخش و ناپەسندن.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا بە هەموو

---

1ـ الطبراني، المعجم الكبير، الرقم: 8585، 113/9.

شێوەیەك لەباربردن بەكاردەهێنن، جا پێویست بێت یان نا، ئایا كۆرپەلەكە ئەندامەكانی خولقێنراوە یان نا؟ ئەوەش بووە هۆی دروست بوونی جۆرێك لە پشێوی لەناو كۆمەڵ بەبێ گوێدانە ئاین و خوو ڕەوشت. چونكە یاساكانی دەستكرد ملی شۆڕ كردووە بۆ هەواو ئارەزووی یاسا دارێژەكان و سەركردەو پیاوە ڕامیاریەكانی وولاتە زلهێزەكان.[1]

له كتابی (كتاب بحوث فقهية في مسائل طبية معاصرة): ( له ڕۆمانیا ژمارەی لەباربردن زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی منداڵبوونی ئاسایی، وولاتیش دوای ئاوڕدانەوە لەو ڕێژەیە زۆرەیە گەیشتە ئەو باوەڕەی كە ئەوە واتای خۆكوشتنی بە كۆمەڵە، ئەوەش وای كرد لە حكومەت كە بڕیار بدات تەنها لەباربردنی چارەسەری پزیشكی ڕێگە بدات. هەروەها هانی ئافرەتانیاندا بۆ ئەوەی منداڵیان ببێ، هەروەها پاداشتەكی ماددیان دانا بۆ ئەو ئافرەتانەی كە منداڵیان دەبێ ومۆڵەتیشیان دان لە كاركردن بە مووچەی تەواو.[2]

له بەریتانیا وای لێهاتووە لەباربردن بۆتە بازاڕێكە بازرگانی و دەوڵەمەند بوونی خێرای ئەندازە بەدەر.[3]

## بەندی سێیەم: ماكە خراپەكانی لەباربردن ( مضاعفات الاجهاض )[4]

### بڕگەی یەكەم: ماكە خراپە هەنوكەییەكان ( المضاعفات الآنية - Immediate Complications)

سالانە 20-30 ملیون كرداری لەباربردن ئەنجام دەدرێت لە جیهاندا بە شێوەیەكی شەرعی، مەبەستمان لەشەرعی ئەوەیە: كەوا لەژێر چاودێری میری و

---

1 ـــ عبد الحليم عويش، موسوعة الفقه الإسلامي المعاصر، 529/2 .

2 ـ المحمدي، علي محمد، بحوث فقهية في مسائل طبية معاصرة، ص211.

3 ـ المصدر نفسه، ص211.

*4—Stuart & Cristoph Obstetric by ten teachers. P: 79.*

*- James R.Scott et al. Danforths, Obstetric&Gynecology. P: 577.*

سەرپەرشتی پزیشك ولەناو نەخۆشخانەکان ئەنجام دەدرێن. هەروەها 10-20 ملیۆن لەباربردنی نا شەرعی ئەنجام دەدرێت بەبێ ئاگاداری حکومەت. تەنها لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا 1.4 ملیۆن لەباربردن ئەنجام دەدرێت .[1]

لەباربردن بەبێ زیان وبەبێ کاریگەریە لابەلایەکان نیە، گەر لە پێشکەوتووترین نەخۆشخانەو پێشکەوتووترین وڵات ئەنجام بدرێت. لەو کاریگەریە لابەلایانە:

1- سەرنەکەوتن لە فراوان بوونی ملی منداڵدان، بەمەش هەموو پێکهاتەکانی ناو منداڵدان نایەتە دەرەوە.

2- قلیشان ودڕانی منداڵدان.

3- خوێن تێزانێکی توندی چینی ناوەوەی منداڵدان.

4- کاریگەریە لابەلاکانی کرداری بێ هۆش کردن (بەنج کردن- سڕکردن).

5- خوێن بەربوونی توند.

6- هەست کردن بە ئازارێکی زۆر لە کۆئەندامی زاوزێ ومەمك.

7- تووش بوونی ئافرەت بە حەساسیە، بە هۆی خوێن وەرگرتن، دەرمانی بێ هۆشی، یان دەزگاکانی لەباربردن.

8- برین وڕوشانی ئەندامەکانی ناوەوەی زاوزێ وئەندامەکانی تر.

**بڕگەی دووەم: ماکە خراپە دواکەوتووەکان (المضاعفات المتـاخرة - Delayed Complications)**

1- مانەوەی هەندێ لە پاشکۆکانی سك پڕی.

2- تووش بوونی ئافرەتەکە بە هەوکردن ونەزۆکی.

3- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ.

4- بەردەوامی سك پڕی وهەرەس هێنانی کرداری لەباربردنەکە.

5- سك پڕی هێشوویی (الحمل الكتلوي- Molar Gestation).

---

1- *James Scott et al. Obstetric&Gynecology. P: 567.*

**برگەی سێیەم: ماکە خراپە درێژخایەنەکان : مضاعفات طويلة الأمد- Long Term Complications)**

1- بریندار بوونی ملی منداڵدان.

2- پێکەوەلکانی چینی ناوەوەی منداڵدان.

3- هەوکردنی درێژەخایەنی زێ ومنداڵدان.

4- خەمۆکی وپشێوی دەرونی وهەست بە گوناهوتاوان کردن بۆ ماوەیەی چەند هەفتەیەك یان چەند مانگێك، یان زیاتر. بۆیە پێویستە پێش ئەنجامدانی ئەو کردارە، ئافرەتەکە رێنمایی وئامۆژگاری بکرێت تاوەکو لە رووی دەرونیەوە ئاسوودە بێت.

**بەندی پێنجەم: هۆیەکانی مردن لە کاتی لەباربردن (أسباب الوفاة في الإجهاض- Mortality)**

1- هەوکردنە بۆگەن بووەکان (الالتهابات الخطيرة- Sepsis)، بەتایبەتی پاش بەکارهێنانی دەزگای پاك نەکراوە لە کۆئەندامی زاوزێ.

2- جەڵتەی سیەکان (جلطة رئوية- Pulmonary Embolism)، وجەڵتەی هەوایی (جلطة هوائية- Air Embolism).

3- نسکۆی لەناکاو (الإغماء) کاتی کرداری بێ هۆش کردن (العارض التخديري الفجائي- Anaesthetic Accident).

4- خوێن بەربوونی توند.

5- کەمتەرخەمی لە کرداری گواستنەوەی خوێن.

6- تووش بوون بە نەخۆشیە گوازراوەکانی ترسناك، وەکو: ئەیدز، هەوکردنی جگەری ڤایروسی وزۆری تر.[1]

---

*1 – Stanly.G.Clayton et al. Gynaecology by ten teachers. P: 287.*

ڕێژەی مردن زیاد دەکات بە زیاد بوونی تەمەنی کۆرپەلە – بەرەو پێشەوە چوونی سك پڕی.

ئەو کاریگەرە لابەلایانەی باسمان کردن، تەنها ئەوانەن کەوا ڕوودەدەن لە کرداری لەباربردن کە لە نەخۆشخانە تازەکان ئەنجام دەدرێن، لە ژێر چاودێری پزیشکی پسپۆڕ، بەڕەزامەندی وبڕیاری دوو پزیشك، واژۆی دوو کەسی نزیکی ئافرەتەکە، دیاری کردنی تەمەنی کۆرپەلەو باری تەندروستی ئافرەتەکە، دیاری کردنی جۆری نەشتەرگەری گونجاو. ئاخۆ دەبێ کاریگەریە لابەلاکانی ئەو لەباربردنانەی ئەنجام دەدرێن لەپەنا دەرگا داخراوەکانی ماڵان وکلینیکی پزیشکە بازرگانەکان، بەدەستی ئافرەتانی نەشارەزا، بەکارهێنانی کەل پەل ودەزگای پیس، دەرمانی نەناسراو، لە بارێکی دەرونی نالەبار، ئاخۆ دەبێ ڕێژەی مردن و کاریگەریە لابەلایەکان چەند زیاد بکات. ئایا ئەوەیە مافی ئازادی وسەربەستی بێ سنووری ئافرەتان؟ ئایا لە کوێن ماف پەروەرانی ئافرەت بۆ بەرگری کردن لەو هەموو شکاندنەوەو بەکەم گرتن وئازاردانی ئافرەتان؟ ئایا ئەو شوێنانە گونجاون بۆ گیانلەبەران تاوەکو گونجاو بێت بۆ ئافرەتان بۆ ئەنجامدانی ئەو کردارە ترسناکە؟ ئایا ئەو بارە دەرونیە گونجاوە کە ئافرەت لەو ماوەیەدا تیایدا دەژیت؟ ئاخۆ ناپرسن کێ و چ بەرنامەیەك هۆکارو بەرپرسیارە بۆ ئەوەی ئافرەتان تووشی ئەو جۆرە لەباربردنە ببن؟ ئایا تێرکردنی ئارەزوویەکی کاتی کورت ئەو هەموو ئیهانەو دەردەسەری و نەهامەتی و ئەو بارە تەندروستی و دەرونیە نالەبارە دەهێنێ؟

بۆیە داواکارم لە ئافرەتانی بەڕێز، بەرنامەی ڕەسن و پەسەند جیا بکەنەوە لە بەرنامەی قەلپ و نامۆو ناپەسەند، دۆست و دوژمنی خۆیان بناسن، ئارەزووی کاتی لەگەڵ خۆشی دونیاو دواڕۆژ تێکەڵ نەکەن.

# باسی دووەم

## حوکمی لەباربردن لە ئیسلامدا

بەندی یەکەم: ڕای زانایانی مەزهەبەکان لەسەر لەباربردنی چارەسەری

بەندی دووەم: ڕای زانایانی سەردەم لەسەر لەباربردنی چارەسەری

بەندی سێیەم: چارەسەری کێشەی لەباربردن

## بەندی یەکەم: ڕای زانایانی مەزهەبەکان لەسەر لەباربردنی چارەسەری

### 1ـ ڕای شافیعیەکان:

لە کتێبی(نهاية المحتاج للرملي) دا هاتووە:( زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر لەباربردن پێش 40 ڕۆژ، کۆمەڵێکیان دەڵێن: حوکمی لەباربردن هەمان حوکمی زیندەبەچاڵی لەسەر نادرێ، کۆمەڵی دووەم دەڵێن: حورمەتی خۆی هەیە نابێ لەناوبردرێ وبهێندرێتە دەرەوە پاش جێگیر بوونی لە ناو منداڵدان، بەپێچەوانەی بەربەستکاری.[1]

ئیمامی غەزالی لە زاناکانی شافیعیە دەڵێ: بەربەستکاری وەك لەباربردن وزیندەبەچاڵی نیە، چونکە لەباربردن وزیندەبەچاڵی لەناوبردنی شتێکە کە بوونی هەیە، ئەویش چەند پلەیەکی هەیە: پلەی یەکەم بەیەك گەیشتنی هێلکەو سپێرمە و جێگیر بوونی لەناو منداڵدان وئامادەگی بۆ چوونە ناو ژیان، لەناوبردنی تاوانە. ئەگەر گەیشتە پلەی هەڵواسراوەو گۆشتە جوراوە ئەوا تاوانەکە زیاتر دەبێت، ئەگەر گەیشتە قۆناغی خولقان وهاتنەبەری ڕوح وگیان ئەوە تاوانەکەی زۆر زیاترو گەورەترە، گەورەترین تاوانیش ئەوەیە کاتی داپچڕانی کۆرپەلەیە لە منداڵدان بە زیندوویی.[2]

### 2ـ ڕای حەنەفیەکان:

لە کتێبی (رد المحتار على الدر المختار)دا هاتووە:( ئایا لەباربردن دوای سك پڕی ڕێگە پێدراوە؟ بەڵێ موباحە مادام نەخولقاوە، خولقانیش نابێ تاوەکو نەگاتە 120 ڕۆژ، ئەوان مەبەستیان خولقانی ڕوح وگیانە.[3]

---

1ــ الرملي، شمس الدين،محمد بن أحمد ت:1004هــ، نهاية المحتاج إلى شــرح المنهــاج 416/8.

2ــ الغزالي، إحياء علوم الدين، 51/2.

3ــ ابن عابدين، رد المحتار على الدر المختار، 176/3.

لە کتێبی (الفتاوى الخانية) دا هاتووە: (لەباربردن پێش هاتنی ڕوح وگیان بەبێ هۆ نابێت، دوای هاتنی ڕوح وگیان هەرگیز نابێت، ئەگەر لەباربردرا ئەوا دیەی غوڕەی [1] (الغرة) دەکەوێتەسەر. [2]

## 3ـ ڕای مالیکیەکان:

لە کتێبی (الشرح الكبير للدرديري) دا هاتووە: ( نابێت ئەو ئاوەی بۆتە پێکهاتە لەناو منداڵدان بهێنرێتە دەرەوە هەرچەندە پێش 40 ڕۆژیش بێت، ئەگەر ڕوح و گیانیشی هاتەبەر ئەوا حەرامە بە ڕای سەرجەمی زانایان. [3]

## 4ـ ڕای حەنبەلیەکان:

لە کتێبی (أحكام النساء) دا هاتووە: ( لەباربردنی ئەنقەست پێچەوانەی ویستی خوایە، مەگەر لەسەرەتای تەمەنی بێت پێش هاتنی ڕوح وگیان، بەلام دوای ڕوح و گیان تاوانێکی گەورەیە، چونکە کۆرپەلە بەرەو تەواوبوون وپێگەیشتن دەڕوات، تاوانی پێش ڕوح وگیان کەمترە لەوەی دوای ڕوح و گیان. [4]

هەروەها دەڵێن: لەباربردن دوای ڕوح وگیان وەك کوشتنی ئادەمیزادێکی باوەڕدارە. [5]

---

1 ـ الغرة: ڕێژەیەکی دیاری کراوە لە دیەی تەولو، لا سەرجەمی زانایان بریتیە لە نیو لە دەیان.
الجرجاني، التعريفات، ص92.

2 ـ الفرغاني، فخر الملة والدين قاضي خان محمود ت:592هـ، الفتاوى الخانية وهي مطبوعة على هامش الفتاوى الهندية. الفتاوى الهندية: جماعة من علماء الهند في الحادي عشر للهجرة بتكليف من السلطان أبي المظفر محي الدين، مصر، مطبعة الأميرية ببولاق.1310هـ،410/3.

3 ـ الدردير، الشرح الكبير،266/2.

4 ـ ابن الجوزي، أحكام النساء، ص374.

5 ـ ابن حزم الظاهري، المحلى، 31/11.

### 5ـ ڕای زاهیریەكان:

لە كتێبی (المحلّی)دا هاتووە: (لەباربردنی بە ئەنقەست خوێنێكی بچوكی (دیّـة الغرّة) لەسەرە ئەگەر پێش هاتنی روح وگیان بوو، بەڵام دوای هاتنی روح وگیان، ئەوا غورەو كەفارەی (الغرة والكفارة) لەسەرە گەر بە ئەنقەست نەبوو، ئەگەر بە ئەنقەستیش بو ئەوا تۆڵەسەندنەوە لەسەرە یان فدیەی مالّی(القصاص أو الفدیة المالیة). [1]

دوای هێنانەوەی ڕای زانایانی مەزهەبەكان دەگەینە ئەو ئەنجامانەی خوارەوە:

1- ئیمامی غەزالی لە شافیعیەكان، هەندێ لە حەنەفیەكان، مالیكیەكان، زاهیریەكان، لەسەر ئەو ڕایەن كەوا لەباربردن حەرامە هەرچەندە ئەگەر كۆرپەلە لە قۆناغەكانی سەرەتای ژیانیدا بێت، واتە پێش 40 ڕۆژ بێت- پێش هاتنی روح وگیان بۆ ئەو بوونەوەرە نوێ یە.

بەڵام زانایان ڕایان جیاوازە دەربارەی ئەوەی ئایا روح هاتبەری ئەو بوونەوەرە لە دوای 40 ڕۆژە یان لە دوای 120 ڕۆژە.

شافییەكان دەڵێن 40 ڕۆژە، حەنەفیەكان دوو ڕای جیاوازیان هەیە: هەندێكیان دەڵێن 40 ڕۆژە وئەوانی تر دەڵێن 120 ڕۆژە.

بەڵگەی زانایان لەسەر ئەوەی كەوا هاتنەبەری روح بۆ كۆرپەلە دوای 40 ڕۆژە یان 120 ڕۆژ ئەمانەن:

لە ئیبن مەسعود ﷺ دەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی كە ڕاستگۆ ترینی ڕاستگۆیانە: (( هەریەكێكتان لە سكی دایكی كۆدەكرێتەوە لە ماوەی 40 ڕۆژ، دوای دەبێتە هەڵواسراوە بەهەمان شێوە، دوایی دەبێتە گۆشتە جوراو بەهەمان شێوە، پاشان خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێ فەرمانی چوار ووشەی پێدەكات كە بینووسێ: كاری ، ڕزق وڕۆزی، خۆشبەختە، یان ماندووە، پاشان روح وگیانی دێتەبەر)).(( أن أحدكم یُجمَع خلقه في بطن أمه أربعین یوماً، ثم یكون علقة مثل ذلك، ثم یكون مضغة مثل ذلك، ثم یبعث الله ملكاً یؤمر بأربع كلمات ویقال له:

---

1 ــ ابن قدامة، المغني، 413/8.

أكتب عملَه ورزقه وشقيّ وسعيد. ثم ينفخ فيه الروح)). [1]

ئەو فەرموودەیە وای کردووە زۆربەی زانایان لەگەڵ ئەو ڕایە دابن کەوا کۆرپەلە 40 ڕۆژ دڵۆپە ئاوێکە، 40 ڕۆژی تر هەڵواسراوەیە، 40 ڕۆژی تر گۆشتە جوراوە، پاشان روح وگیانی دێتەبەر، بەمەش تەمەنی کۆرپەلە دەگاتە 120 ڕۆژ.

بەڵام کۆمەڵی دووەم لە زانایان دەڵێن هاتنەبەری روح لە 40 ڕۆژی یەکەمە بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیە. لە ئەبو حوزەیفەی کوڕی ئوسەیدی ئەنساری ﷺ [2] دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر 42 ڕۆژ بەسەر دڵۆپە ئاو تێپەڕی، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە دەکات وشێوەکەی دیاری دەکات، گوێ، چاو، پێستە، گۆشت، ئێسقانەکانی دەخولقێنێ، پاشان دەڵێ: ئەی خوایە نێرینەیە یان مێینەیە)). ((إذا مرّ بالنطفة اثنان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها، ثم يقول: أي رب ذكر أم أنثى)). [3]

زەمەلکانی دەڵێ: ئامرازی نیشانە لەو فەرموودەیە کە بریتیە لە (بەهەمان شێوە- مثل ذلك) نابێت دووبارە بکرێتەوە نە بۆ 40 ڕۆژەکان ونە بۆ سکی دایک، بەڵکو ئەو ئامارە کردنە بۆ هەموو خولقاندن، نەوەك بۆ 40 ڕۆژەکان. واتە (يجمع في بطن أمّه: واتای ئەوەیە بە مەحکەمی دەخولقێنرێ وتەواو دەبێت. هەروەك چۆن لە زمانی عەرەبی دەڵێین: پیاوێکی کۆکراوەیە، واتە هەموو سیفاتی خولقاندنی تیایە. [4]

---

1ــ البخاري كتاب بدأ الخلق، باب: ذكر الملائكة الرقم:3232،3208، 365/6. وسنن البيهقي الكبرى، الرقم: 15198،7/421. التاج الجامع للأصول، الناصف،37/1.كتاب الإيمان. وابن رجب، جامع العلوم والحكم، 153/1.

2 ــ حذيفة بن أسيد الغفاري: أبو سرحة، پەیمانی حودەیبیەی دیووە، لە کوفە دانیشتووە، فەرموودەی گێڕاوەتەوە، ئیمام موسلم خاوەنی سوننەکان لێیان وەرگرتووە. ساڵی 42ك کۆچی دوایی کردووە.

ابن حجر، الإصابة الرقم:1640، 475/1.

3 ــ مسند الإمام أحمد،6/4. والشيباني، أحمد بن عمرو، الأحاد والمثاني، 257/2.

4 ــ الزملكاني، كمال الدين عبد الواحد، البرهان الكاشف عن إعجاز القرآن، ص275.

2- کۆمەڵی زانایان لەگەڵ ئەوەن کەوا لەباربردن حەرامە پاش هاتنەبەری روح. ئەگەر چوار مانگ بەسەر سک پڕیدا تێپەڕێت- پاش هاتنەبەری روح. باری نەخۆشی ویێویستیشیان هەڵنەوێردووە(استثناء) کردووە تاوەکو ئافرەت تووشی زیان نەبێت، بەڵکو گوتویانە دەبێ دیە بدرێت ئەگەر بە زیندوویی بێتە دەرەوە، خوێنی غورەی لەسەرە ئەگەر بە مردوویی بێتە دەرەوە، چونکە ئەوە تاوانە بەرامبەر یەکێکی زیندوو.[1]

هەندێ لە زانایان لەباربردنیان بە جائیز دانەناوە هەتا ئەگەر بێتە هۆی مردنی دایکەکەش، هەروەك لە کتێبی (فتاوی الخانية)دا هاتووە:(ئەگەر کۆرپەلە نەتوانرا لە سکی دایکی بیهێننە دەرەوە تەنها بەوەی نەبێت کە پارچە پارچەی بکەن، گەر ئاواش نەکەن دایکەکە دەمرێت، دەڵێن: ئەگەر کۆرپەلەکە مردبوو ئەوا هیچ کێشەی تیا نیە، بەڵام گەر زیندوو بوو، ئەوا ئەو کارە جائیز نیە، چونکە کوشتنی نەفسێك حەرامە لە پێناوی مانەوەی نەفسێکی تر، بەبێ ئەوەی تاوانی ئەوی تیا بێ، ئەوەش کارێکی پوچەڵە.[2]

## بەندی دووەم: ڕای زانایانی سەردەم لەسەر لەباربردنی چارەسەری

### 1- ڕای زوحەیلی:

گووتەی راجح ئەوەیە کە لەباربردن جائیز نیە هەر لە سەرەتای سک پڕی وخولقاندنی کۆرپەلە، تەنها بۆ پێویستیەکی وەك نەخۆشیەکی کوشندە، نەخۆشی گوازراوەی وەك سیل، شێرپەنجە، نەمانی شیر بۆ منداڵە ساواکەی لەبەر ئەو سک پڕیەی ئێستا، پیاوەکەش توانای ئەوەی نیە دایەنێکی بۆ بگرێت، بەمەش ژیانی منداڵەکە دەکەوێتە مەترسیەوە. هەروەها دەڵێ: من هەمان ڕای ئیمامی غەزالیم هەیە کە دەڵێت: لەباربردن هەر لە یەکەم ڕۆژی سک پڕیەوە وەك ئەوەیە کە زیندەبەچاڵی نەفسێکی کردبێ کە بوونی هەیە.[3]

---

1ـ ابن قدامة، المغني، 535/9. وابن عابدين، رد المحتار على الدر المختار، 377/5.
2 ـ الفتاوى الخانية3/.410 والفتاوى الهندایة 360/5.
3 ـ الزحيلي، وهبة، الفقه الإسلامي وأدلته، 2646/4.

**2- ڕای بوطی:**

حوكمی ڕاجح لە بابەتی لەباربردن ئەوەیە كە زانایانی شافیعی وحەنفیەكان لەسەری ڕێك كەوتوون، ئەویش ئەوەیە كە جائیزە لەباربردن ئەگەر لە پێش 40 ڕۆژی تەمەنی كۆرپەلە بكرێت، ئەویش ئەو ماوەیە كە خولقانی كۆرپەلە دەست پێدەكات، بەمەرجێ ئەو سك پڕیە لە ئەنجامی نیكاحەكی دروست هاتبێ، هاوسەرە ئافرەتەكەش ڕەزامەندی هەبێ، لەلایەن پزیشكەكی متمانە پێكراو بڕیاری ئەوە هەبێ كە ئەو لەباربردنە زیانی نیە.[1]

**3- ڕای مەحمود شەلتوت:**

ئەگەر سەلمێنرا لە ڕێگەیەكی باوەڕ پێكراوەوە كە مانەوەی كۆرپەلەی زیندوو، بێ گومان هۆكار دەبێ بۆ مردنی دایكی، شەریعەتیش بەگوێرەی بنەماكانی فەرمان دەدات بە هەڵبژاردنی كەمترین زیان. چونكە مانەوەی كۆرپەلە واتە مردنی داكەكە، هیچ چارەش نیە تەنها لەباربردن نەبێ، دایكەكەش ئەسڵەو ژیانی جێگیرە، بۆیە كۆرپەلە لە پێناوی ئەودا لەباردەبردرێت.[2]

**4- ڕای سەید سابق:**

پاش جێگیربوونی دڵۆپە ئاو لەناو منداڵدان، جائیز نیە لەباربردن پاش120 ڕۆژ. چونكە دوای ئەو ماوەیە لەباربردن تاوانە دەكرێت دژی نەفسێك وسزای دەكەوێتە سەر لە دونیاو دواڕۆژ. بەڵام لەباربردن پێش ئەو ماوەیە120 ڕۆژ جائیزە ئەگەر هۆكارێكی پێویست هاتە پێشەوە.[3]

---

1ـ البوطي، تحديد النسل، ص89.

2 ـ شلتوت، الفتاوى، بيروت، دار الشروق،1975م، ص289.

3ـسيد سابق، فقه السنة، 195/2.والدمشقي،عرفان سليم، جامع المهلكات من الكبائر والمحرمات، ص52.

### 5-ڕای یوسف قەرەزاوی:

لە بنەڕەتی شەریعەتدا لەباربردن حەرامە، لەگەڵ گەورە بوونی تەمەنی کۆرپەلەو جێگیربوونی ژیانی حەرام بوونەکەش گەورەتر دەبێت. هەموو زانایان لەگەڵ ئەوەن ئەگەر کۆرپەلە ڕوح وگیانی لەبەر بوو ئەوا بۆ موسڵمان نیە ئەو کارە ئەنجام بدات، چونکە تاوانە دژی نەفسێکی زیندووی تەواو و ژیان دیاری کراو. هەربۆیە ووتویانە: ئەگەر سکەکە لەباربردرێت و کۆرپەلە بە زیندوویی هاتە دەرەوە ئەوا دیەی لەسەرە، ئەگەر بە مردوویش هاتە دەرەوە ئەوا سزایەکی مالی لەسەرە.[1]

## بەندی سێیەم: چارەسەری کێشەی لەباربردن

پێش ئەوەی باسی چارەسەری کێشەی لەباربردن بکەین وام بە پێویست زانی کەوا هەندێ ووردەکاری هەیە دەربارەی چۆنیەتی خولقانی کۆرپەلە باسیان بکەم تاوەکو هەر بڕیارێك دەدرێت دەربارەی لەباربردن لەسەر بنەمایەکی زانستی بێت.

ئەو زانیاریانەی کە لەو بەندەدا باسیان دەکەم لەلای پزیشکانی شارەزا شاراوە نیە، بەڵام بەداخەوە ئەو ووردەکاریانە لە خولقانی کۆرپەلە بە گرنگ بەرچاو ناگرن، لەبەر کەم بیرکردنەوەیانە لە گەورەیی ئەو کردارەی خوای گەورە کە چۆن ئەو هێلکەو سپێرمە هەر لە یەکەم ساتی نزیك بوونەوەیان بەبەرنامەیەکی زۆر ووردو دارێژراو پێتێن دەکەن ودوایی ئەو کیانە نوێ یە بەشێوەیەکی زۆر سەر سوڕهێنەر کارەکانی خۆی ڕێکدەخات تاوەکو خۆی هەڵدەواسێ بە دیواری منداڵدان، لەهەر گۆڕانکاریەکیش لە قوناغەکانی ژیانی یەکێك یان زیاتر لە هۆرمونەکان کار ئاسانی بۆ دەکەن ولەخزمەتی دان تاوەکو دەگاتە قۆناغی دوایی کە لەدایك بوونە. لەگەڵ هەر گۆڕانکاریەکیش کە لە تەمەنی ئەو کۆرپەلەیە ڕوودەدات ئەوا گۆڕانکاریش لە جەستەو دەرونی دایکەکەش ڕوودەدات بۆ ئاسانکاری و دابین کردنی ژیانی ئەو بوونەوەرە تاوەکو هاتنە دەرەوە بۆ ژیانی دونیا. یان پزیشکان ئەو خاڵانە دەزانن

---

1ـ القرضاوي، فتاوى المعاصرة، 595/2. والقرضاوي، الحلال والحرام في الإسلام، ص195.

بەلام بەرژەوەندی ماددی وای لە هەندێکیان کردووە هەر گرنگی بەو کردارە سەر سورهێنەرە نەدەن، وەك کردارێکی سروشتی تەماشای بکەن، وا دەزانن هەروەك کرداری گەشەو گەورەبوون وگەڕانەوەی هەندێ لە شانەو خانەی شوێنەکانی ترە وەك ماسولکە وئێسقان وئەندامەکانی تر کاتێ تووشی بە بڕین ولابردن دێت بەهۆی ڕووداوەکی دەرەکی یان نەشتەرگەری؟ ئەوەش چاك دەزانێ کە وانیە. یان نازانێ خۆشی هەر بەو ڕێگەیە خولقێنراوەو بۆتە کیانێکی سەربەخۆو کاریگەر؟ ئایا نازانێ ئەو بوونەوەرە نوێ یە لەوانەیە بەیانی کاتی بێتە دونیا وەك ئەو نابێ یان لەو گرنگ ترو پایە بەرزتر وکاریگەرتر نابێ، یان نابێتە هۆکاری گۆڕینی زۆر شت لەژیانی مرۆڤایەتی؟ چۆن وا بە ئاسانی بڕیاری لەناو بردنی دەدات؟

بەهەمان شێوە زانایانی ئاینی بەبێ ئەوەی زانستی پزیشکیان هەبێ لەسەر ئایەتەکانی قورئان فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ بڕیار لەسەر ئەو جۆرە کارانە دەدەن، نازانن ئەو گۆڕانکاریانەی لەو کردارە ڕوودەدات بۆ خولقاندنی پیرۆزترین بوونەوەرە کە ئادەمیزادە؟ ئایا نازانن لای خوا چەند بەرێزو گەورەیە؟ ئایا لە پیرۆزترین شوێن لە سەر زەوی کە ماڵی خوا خۆیەتی پیرۆزتر نیە؟ ئایا لە جوانترین شێوەو دیمەن دروست نەکراوە؟ ئایا لە روحی خوای گەورە فووی تیا نەکراوە؟

وەك برایەکی بچوکتان داواکارم وهیوادارم لە هەردوو کۆمەڵ پزیشکان وزانایانی ئاینی بەهاوکاری یەکتری وتاوتوێکردنی بابەتەکە، بە بەڵگەی پزیشکی وزانست وشەرعی ڕەسەن ومتمانە پێکراو بڕیاری ئەو کارە بدەن تاوەکو تووشی تاوانی دونیایی سزای دوارۆژ نەبن. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ الذاريات: 55 هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان دەفەرمووێ: ((دین بریتیە لە ئامۆژگاری)). ((الدين نصيحة، قلنا لمن؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم)).[1]

---

1 ــ ناصف، منصور علي، التاج الجامع للأصول، 27/1. رواه الخمسة. عن التميم الداري.

## بڕگەی یەکەم: هەندێ خاڵی شاراوە لە کرداری خولقانی کۆرپەلە

ئەو خاڵەی کەبۆتە هۆکاری کێشەو جیاوازی ڕایەکان لە نێوان زانایان ئەوەیە ئایا هاتنەبەری ڕوح لە دوای 40 ڕۆژە یان لە دوای 120 ڕۆژە. ئەو بوونەوەرە هەڵسوکەوتی وەك ڕوح لەبەرو گیانلەبەر وایە هەر لەسەرەتای ڕۆژەکانی یەکەمی ژیانی، چونکە خۆی ئامادە دەکات کە لە پاشەڕۆژێکی کورت ببێتە ئادەمیزادێك وەك ئەوانەی دەیانەوێ بڕیاری کوشتنی بدەن.

هەروەك شاراوە نیە لای کەستان کە دوای ئەوەی هێلکە پیتێنرا دەست دەکات بە دابەش بوون، پاش گەیشتنە 32 خانە پێی دەڵێن شێوە (التوتة – Morula)، کە خانەی ناوەکی ودەرەکین، پاشان بۆشایی ناوەوەی ئەو شێوە تووتە پڕ دەبێت لە شلە، ئەوکات پێی دەڵێن گۆی میکرۆبی – تورەکەی میکرۆبی (الكرة الجرثومية– Blastula). خانەکانی ناوەوە دەگۆڕێن بۆ خانەی کۆرپەلە (الخلايا الجنينية– Embryoblast) وخانەکانی دەرەوەش دەگۆڕێن بۆ بخۆرە خانە (الخلايا الخارجية الآكلة– Trophoblast) ولە دوایدا دەگۆڕێ بۆ ویلاش. خانەکانی دەرەکی دەگۆڕێن بۆ دوو خانەی جیاکەرەوەی تایبەتمەند:

**یەکەم: خانە بخۆرەکان: (الخلايا الآكلة- Cytotrophoblast):**

بەهۆی ئەو خانانەوە شێوە توو دەتوانێ خۆی هەڵواسێ بە دیواری منداڵدانەوە، کە بە شێوەیەکی لەسەرخۆ خۆی دەخزێنێتە ناو دیوارەکە تاوەکو دەگاتە قوڵایە لینجە چین ودەریاچەکانی خوێن. ئەو کردارە ناسراوە بە تێخزانی سەرەتایی، کە 4 ڕۆژ دەخایەنێ. بەڵام بۆ ئەوەی بەتەواوی خۆی هەڵواسێ ئەوا 8 ڕۆژ دەخایەنێ. هەر لەو کاتەوە هەڵواسراوە دەست دەکات بە ڕژاندنی هۆرمونی ( ماندەری هۆرمونی سك پڕی).

**دووەم: بخۆرە خانەی دەنکدار (الخلايا المخلوية الآكلة- Syncytiotrophoblast):**

دەست دەکات بە کرداری هەرس ومژینی خۆراك، ڕژاندنی هۆرمونی ماندەری هۆرمونی سك پڕی ( الحافز لهرمون الحمل– Human Chorionic Gonadotropin H.C.G).

ئەوەی بۆ بابەتەکەی ئێمە گرنگە ئەوەیە کە ئەو جۆرە خانەیە ئەو هۆرمونە دەڕژێنن تاوەکو ئەو هەڵواسراوە بەردەوام بێت لە ژیان وکرداری سک پڕیەکەش بگاتە قوناغەکانی کۆتایی. ئەو هۆرمونە H.C.G دەبێتە هاندەرێك بۆ زەردە تەنی ناو هێلکەدان تاوەکو (هۆرمونی سک پڕی- پرۆجیستیرۆن) دەربدات، واتە ئەو هۆرمونە هاندەرو هاوکاری زەردە تەن دەکات بۆ ماوەی دوو مانگ کاری خۆی جێبەجێ بکات، ئەویش ڕژاندنی هۆرمونی سك پڕیە. لە هەمان کاتدا لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا وێڵاش تەواو گەشە دەکاو شوێنی زەردە تەن دەگرێتەوە لە ڕژاندنی هۆرمونی سك پڕی.[1]

لێرەوە گرنگی ئەو هۆرمونەمان بۆ دەردەکەوێ لەسەرەتای ژیانی هێلکەی پیتێنراو، بەوەی:

1- ئەگەر ئەو هۆرمونە نەبوایە ئەوا هەڵواسراوە نەیدەتوانی لە ژیان بەردەوام بێت.

2- ئەو هۆرمونەش دوای 8 ڕۆژ لەناو خوێنی دایك دیار دەکەوێت، دوای 10 ڕۆژیش لەناو میزی دایك دیاردەکەوێت. ئەوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر بوونی سك پڕی لە ڕۆژانی سەرەتای ژیانی کۆرپەلە. ئەو هۆرمونەش لەناو خوێنی دایك دەمێنێ بە ئاستی جیا جیا تاوەکو کۆتایی گشت قۆناغەکانی سك پڕی. ئەگەر ڕێژەو ئاستی ئەو هۆرمونە دابەزی لە خوێن، ئەوا نیشانەیە لەسەر ڕوودانی لەبارچوون، یان واتای سك پڕی لە دەرەوەی منداڵدان دەگەیەنێ. ئەگەر ڕێژەی ئەو هۆرمونەش بەرز بۆوە لە ناو خوێن ئەوا نیشانەی چەندە سك پڕی- جمکە(الحمل المتعدد) یان سك پڕی هێشوویی(الحمل العنقودی- H.M)، یان سەرهەڵدانی خانەی شێرپەنجەیە لەناو جەستەی کۆرپەلە(سرطان المشیمة -Choriocarcinoma) دەگەیەنێ.[2]

لەو گۆڕانکاری وپێشکەوتنانە بۆمان دەردەکەوێ کۆرپەلە هەر لەسەرەتای ژیانی

---

*1 — Ronald.W.Dudek. High-yield Embryology. P: 11-12.*

*2— Ronald.W.Dudek. High-yield Embryology. P: 12.*

لە قۆناغی هەڵواسراوە هۆرمونی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر ئەو هۆرمونەش نەبوایە ئەوا شتێك دروست نەدەبوو بەناوی سك پڕی. هەربۆیە بەو هۆرمونە ووتراوە هۆرمونی سك پڕی (پرۆجیسترون).

هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی هۆرمونی(H.C.G) لەناو خوێن ولەناو میز، هەروەك ئەوە وایە کۆرپەلە لە سەرەتای ژیانی بە زمان حالی خۆی پێمان رادەگەیەنێ کەوا چاودێری خۆی ودایکەکە بکەین وئاگاداریشمان دەکاتەوە کەوا ئەو خولقاندنی دەستی پێ کردووە بە فەرمانی خوا، ئەو رێگەی بۆی دانراوەو لەسەری دەڕوات بە گوێرەی بەرنامەیەکی داڕێژراو. هەروەك ئەوەیە کە پێمان رادەگەیەنێ ودەڵێ: ئا ئەوەتا نابینن هۆرمونی تایبەتی خۆم هەیە، هەر بەهۆی ئەو هۆرمونەوەش دەتوانن بزانن ئافرەتەکە کە دایکمە سك پڕی هەیە یان نا.

هەروەك لە بەشی دووەم باسمان کرد کەوا قۆناغەکانی خولقاندن دەکرێ بە سێ بەشی سەرەکی:

**قۆناغی یەکەم:**

بەکورتی لەو قۆناغەدا هێلکەی پیتێنراو دست دەکات بە دابەش بوون وگەشە کردن، ڕژاندنی هۆرمونە پێویستەکانی بەردەوامی ژیانی، ئەو قۆناغە بەردەوام دەبێت تاوەکو سەرەتای پێکهاتنی ئەندامەکان وجیابوونەوەو تایبەتمەندی خانەو شانەکان، دوو مانگ دەخایەنێ.

لەو قۆناغەدا جولەی هەڵگیراو (الحمیل) [1] تەنها جوولەیەکی پێگەیشتن وگەشەیە (حرکة تکوینیة أو تطوریة) بەهۆی زۆربوونی ژمارەی خانەکانی. واتە جوولەی تەنها جوولەیەکی دیار کراوی سنووردارە ولە چوارچێوەیەکی تەسکدایە. ناتوانێ وەڵامی کاریگەرەکان وهەستەکانی دەرەوە بداتەوە، ناتوانێ خۆی بجووڵێ بەهیچ شێوەیەك تەنها بەهۆی جوولانەوەی دایکی نەبێ.

---

*1_ Sperber G.H. Craniofacial Embryology. P: 21.*

**قۆناغی دووەم:**

ئەو قۆناغەش دوو مانگ دەخایەنێ تیایدا روح وگیان دێتەبەر ئەو بوونەوەرە نوێ یە، لەهەمان کاتدا لە ئەندامەکان تایبەتمەندی وجیابوونەوە وخولقان دەست پێ دەکات. ئەوەش واتای ئەوەیە بەهۆی بەخشینی روحە لای خوای گەورە، ئینجا خانەو شانەکان تایبەتمەندی وەردەگرن وهەریەکیان جیادەبێتەوە بۆ ئەوەی شێوەو کاری تایبەتی خۆی وەربگرێ وببێتە ئەندامێکی سەربەخۆ( وەك دروست بوونی دڵ، چاو، گوێ، ئەندامەکانی تر). واتە دروست بوونی ئەندامەکان لە سەرەتای هەفتەی نۆیەم دەست پێدەکات ولە کۆتایی هەفتەی شانزەم هەموو ئەندامەکان تەواو دروست دەبن(التكامل)، هەروەك لە فەرموودەکاندا هاتووە و خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ۝٨ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ السجدة:8-9.

**قۆناغی سێیەم:**

لەو قۆناغەدا کۆرپەلە کەسایەتیەکی تایبەتە لە رووی شێوەو پێکهاتەوە ورەگەزەوە، لە خەڵکانی تر جیا دەکرێتەوە. لە هەمان کاتدا فەرمان بە روح دەکرێت بە لێککگرێدانی کاری ئەندامەکان وپەیوەست کردنیان بە مێشکەوە، بەمەش کۆرپەلە وەڵامی هەستە دەرەکی وناوەکیەکان دەداتەوە، دەبیستێ، دەجووڵێتەوە بە ویستی خۆی، دەخەوێ وبەئاگا دەبێ، دەست بە پەتی ناوکەوە دەگرێ، هەندێ جاریش شلەی ئەمنیونی دەمژێ..هتد. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾ المؤمنون:14، واتە لە قۆناغی دووەم دەچێتە قۆناغی سێیەم کە زۆر لێك جیاوازن.

ئەو گۆرانکاریانەش واتای ئەوەیە کۆرپەلە لە قۆناغی سستی دەچێتە قۆناغی چالاکی، هەرچەندە پێش ئەو قۆناغەش لە ژیاندابوو، بەڵام بەهۆی هاتنەبەری روح

(کە لە دوای ڕۆژی 42 وەیە نەوەك 120ڕۆژ، هەروەك لە فەرموودەکاندا هاتووە ولە زانستی پزیشکی کۆرپەلەزانیش بە هەمان شێوە سەلمێنراوە) کەسایەتی خۆی وەرگرت ولە کەسانی تر ناچێت، هەموو سیفەتەکانی جەستەیی وعەقلی خۆی دەبێت. ئەو روحەی کە وەری گرتووە کەسی تر تیایدا بەشداری ناکات وبۆ کەسی تر کۆپی ناکرێتەوە (لەبەری ناگیرێتەوە).[1]

پاش ئەو کورتە باسەی قۆناغەکانی خولقاندن دەگەینە ئەو ڕاستەقینە زانستیانەی خوارەوە.

1- هەڵگیراو (الحمیل- الجنین غیر الناضج) پێش هاتنەبەری روح بوونەوەرێکە دەجولێتەوە لە سنوورێکی دیاری کراوی تەسك، بنەمای خەلق وپێشکەوتن وگەشە وەردەگرێ، هەر دەست تێوەردانێك لەو کردارە دارێژراوە بۆ تێکدانی ئەو کیانە نوێ یە لەناو ئەو شوێنە گونجاوو جێگیرە ئەوا بڕیاری مردنە بۆی دەردەکرێت.

2- روح: نهێنیەکی خوایی یە لە ژیان، فوویکی خوایی یە دەکرێتە بەری بوونەوەرەکان تاوەکو ببێنە ڕێزی زیندووان، روح نیشانەی جوولاوەی بوونەوەرە. هاتووتە خوارەوە لە سەرچاوەیەکی هەمیشە زیندووی بۆ ناو جەستەی ئادەم ونەوەکانی. واتە روح فەرمانێکی خواییە، پەیوەندی دارە بە خوای گەورەوە، هەرکات لە قورئان باس کراوە پەیوەست کراوە بە خوا.[2]

هەر روحیشە هۆکاری سەرەکی خولقان وتایبەتمەندی ئەندامەکانە، هەر ئەویشە هۆکاری جوولەو کارەکانیان، هەر بەهۆی ئەویشەوە پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەر دەکات.

لەبەر ئەو ڕاستەقینە زانستیانە بە هەموو یەقینەوە دەڵێم کەوا کۆرپەلە هەر لە سەرەتای ژیانی، کیانەکی سەربەخۆیەو کەسایەتی خۆی هەیە، بۆیە لەباربردن

---

1ـ ابن قیم الجوزیة، التبیان في أقسام القرآن، ص251. ابن قیم الجوزیة، الروح، ص40.
2ـ الآلوسي، محمود بن عبد الله ، روح المعاني في تفسیر القرآن العظیم والسبع المثاني، 124/21.

جـائیز نیـە مەگـەر لەبـەر هۆکـارێکی زانـستی زۆر پێویـست نـەبێت- ڕوونـی دەکەینەوە لەلاپەڕەکانی داهاتوو- چونکە دەست تیوەردانە لـە مـەخلوقاتی خـوا، لەناوبردنی ملیۆنەها خانەیە، تێکدانی کیانێکە خـوای گـەورە بڕیـاری لەسـەر داوەو ڕوح وگیانی بۆ ناردووە، بنبڕکردنی نەوەکانە. بەبۆچوونی ئیمەش لەباربردن لەپێش هاتنەبەری ڕوح و دوای هاتنەبەری ڕوح یەکسانە لە ڕووی جائیز نەبوونەوە.

## بڕگەی دووەم: وەڵامی هۆکارو پاساوەکانی لەباربردن

هۆکارو پاساوەکانی لەباربردن کە زۆربـەی پزیـشکان و زانایـان لەوخاڵانـە خـۆی دەبینێتەوە، ئێمەش لای خۆمان وەڵامی ئەو خاڵانە دەدەینەوە.

1- ئافرەتەکە لە بارێکی نالەبارە وژیانی کەوتۆتە مەترسیەوە.

2- ئەگەر ئەو سـك پڕیـە بـەردەوام بێـت، ئـەوا لـە دوای خـۆی ئافرەتەکـە بـە تەندروستیەکی نالەبار جێ دەهێلێت.

3- ئەگـەر ئافرەتەکـە منـداڵی شـیرە خـۆرەی هـەبوو ئـەوا ژیـانی دەکەوێتـە مەترسیەوە.

4- ئەگەر پزیشك وای گومان برد کەوا ئەو کۆرپەلەیە بە شێواوی بۆماوەیی(پولد مشوّهاً) لەدایك دەبێ وکەس نیە شیری بداتێ وخزمەتی بکات.

5- کۆرپەلەکە بە نەشتەرگەری لەدایك دەبێ، یان دایکەکە بـە بـێ هێـزی وکـەم توانای دەهێلێتەوە

وەڵامی ئەو ئەگەرانەی سەرەوە دەدەینەوە بە پشتیوانی خوا:

**یەکەم: ئافرەتەکە لە بارێکی نالەبارە وژیانی کەوتۆتە مەترسیەوە.**

پزیشکەکانمان دەتوانن زۆربەی ئەو نەخۆشی وکێشانەی توشی ئـافرەت دەبێـت چارەسەری بکەن، ئەگەر گرنگـی ئـەو بابەتـە ڕوون بکرێتـەوە ئـەوا زۆر بەکارامـەو چالاکانە هەوڵی چارەسەری نەخۆشەکان دەدەن پێش بڕیـاردان لەسـەر لـەباربردن. چونکەی ئەوەی شتێك بەگرنگ بزانێت ئەوا گرنگی پێدەدات.

ئەو نەخۆشیانەی کەوا ژیانی دایك دەخاتە مەترسیەوە زۆرن، بەڵام گرنگ ئەوەیە چۆن وکەی بزانین وبریار بدەین کە ئەو مەترسیە ڕاستەقینەیە یان شتێکی کاتیە وچارەسەر دەکرێت.

1- نەخۆشیەکانی دڵ: ئەوانیش جۆرو ژمارەیان زۆرە، لە گرنگترینیان بریتیە لە تەسك بوونەوەی زمانەی دوانی (التاجی)یە، کە لێدانی دڵ زیاد دەکات، سك پڕیش قەبارەی ئاوی لەش زیاد دەکات، ئەو دوو هۆکارەش دەبنە هۆی کۆ بوونەوەی شلە لەناو سیەکان، ئەو کات ئافرەت توشی تەنگە نەفەسی دەبێت. وا پێویست دەکات بەزووترین کات چارەسەری بکرێت بە کەم کردنەوەی خواردنی خوێ، دەرمانی دابەزینی لێدانی دڵ، دەرمانی میز کردن، پاڵکەوتن وئارام و ئاسوودەیی.[1]

کەواتە لەو بارەدا لەباربردن پێویست ناکات، هەروەها بۆ هەموو بارەکانی تر کە بەم شێوەن.

دەربارەی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن: ئەگەر پێش سك پڕی تووشی ببوو، ئەوا دەبێت بەردەوام بێت لەسەر دەرمانەکان، ئەگەر لەکاتی سك پڕی تووشی بوو، ئەوا دەرمانی تایبەت وەردەگریت، لەگەڵ سەردانی پزیشکی تایبەت بەشێوەیەکی ڕێك. بەمەش کۆرپەلە سەلامەت دەبیت لە سکی دایکی ولەکاتی لەدایکبوونی.

ئەگەر دایك تووشی بەرزبوونەوەیەکی ناکاوی توندی پەستانی خوێن بوو (ارتفاع ضغط الدم الحاد الخبيث- Malignant Hypertention) کە ناسراوە بە (طليعة الارتجاج Pre eclampsia )، لە نیشانەکانی سەریەشە، چاو ڕەشکەو پێشکە، تەنگە نەفەسی بەهۆی ئاو تێزانی سیەکان (الونمة). لەو کاتەدا ئافرەت پێویستی بەوەیە لە نەخۆشخانە بخەوێنرێ، بۆ ئیستراحەت کردن، وەرگرتنی چارەسەری پێویست. ئەگەر چارەسەر نەکرێت ئەوە تووشی بە پەککەوتنی دڵ وگورچیلە دەبێت وتاوەکو دەبێتە ژەهراوی بوونی سك پڕی (الارتجاج الحملي-

---

1 – *Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 462.*

Eclampsia)، ئەگەر ئەو بارە بەردەوام بوو، چارەسەری بۆ نەکرا ئەوا دەبێت کۆرپەلەکە لەبار ببردرێت، جا پێش هاتنەبەری روح بێت، یان دوای هاتنەبەری روح، چونکە ژیانی دایکەکە لە مەترسیەکی ڕاستەقینە دایە، هەروەها پێویستی بەوە نیە هەڵبژاردن(التخيير)[1] بکرێت لە نێوان ژیانی دایك و کۆرپەلەکە. چونکە لەو کاتەدا کۆرپەلە بەبێ دایکی ناتوانێ بژیت، بەردەوامی سك پڕی مانای مردنی دایکەو مردنی کۆرپەلەیە، بۆیە ژیانی دایك گرنگی پێدەدرێت لەسەرەتاو کۆتایدا. بەڵام ئەگەر کۆرپەلە لەتەمەنی دوای شەش مانگی دابوو ئەوا کۆتایی کێشەکە چارەسەر دەکرێت بە نەشتەرگەری قەیسەری(العملية القيصرية) بۆ دەرهێنانی کۆرپەلەکە، یان ڕاکێشانی کۆرپەلەکە بەهۆی قولاب (الكُلاب- Forceps)، چونکە لەو تەمەنە کۆرپەلە لە دەرەوەی منداڵدان دەتوانێ بژیت بەمەرجی چاودێری پزیشکی توند.[2]

2- نەخۆشیە درێژخایەنەکان و هەندێك دەرمان (الأمـــراض المزمنـــة): لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆرە، تەنها باسی هەندێکیان دەکەین:

أ- نەخۆشی ڕۆماتیزمی جومگەکان (مرض روماتيزم المفاصل)

ئەو نەخۆشیە کار لە سك پڕی ناکات، بە پێچەوانەوە سك پڕی وا دەکات ئازارو ژانی جومگەکان کەم بکاتەوە. چونکە لە کاتی سك پڕی ئاستی هۆرمونەکان زیاد دەکات، بەتایبەتی پرۆجیسترون وستیرۆیدەکان بە شێوەیەکی گشتی، ئەوانەش هۆکارن بۆ باشتر بوونی باری نەخۆشەکە. بۆ زانین هۆرمونی ستیرۆیدەکان باشترین چارەسەرە بۆ نەخۆشی ڕۆماتیزمی جومگەکان.[3]

ب- گەرمە سوورەی گورگەیی بڵاوەبوو (ذأب حمـــاموي الكلـــي - Systemic

---

1ـ التخيير: ئەگەر دوو بەرژەوەندی یەکسان بوون، نەتوانرا هەردووکیان ئەنجام بدرێت بەیەکەوە، ئەوە یەکیان پێش ئەوی تریان دەخەین، تارەکو کێشەکە چارەسەر بکرێت. وەك ئەوەی پیاوێك شیری دەرکێشا بۆ کوشتنی دوو موسڵمان، نەمان توانی هەردووکیان بپارێزین، ئەوا لێرەدا سەرپشك دەکەین بۆ پاراستنی یەکیان تەنها.

2 ـ *Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 476-490 .*

*- Stuart&Cristoph. Obstetric by ten teachers. P: 155-150.*

3ـ *Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 410.*

.(Lupus Erythematosus-SLE

ڕێژەی 35-50% ڕێژەوی نەخۆشیەکە ناگوازێ بەهۆی سك پڕی. 50% ی نەخۆشیەکە نیشانەکانی زیاد دەکات، لەو کاتەدا 24%ی ئافرەتانی سك پڕە تووشی لەبارچوونی ئاسایی دەبن، 7.4% کۆرپەلەکە بە مردوویی دەبێت، 33% کۆرپەلەکە پێش وەختە لەدایك دەبێت(Pre-term)، لاوازو بێ هێزە.

چارەسەری: بەهۆی هۆرمونی ستیرۆیدەکانە، تاوەکو نەخۆشیەکە بەرەو پێش نەچێت وکار لە ئافرەتەکەش نەکات، ئەمەش لە ژێر چاودێری پزیشکەوە دەبێت. [1]

ج- ئەو ئافرەتە سك پڕانەی کەوا دەرمانی دژی خوێن مەیین وەردەگرن (الأدوية ضد التخثر - Anti coagulant) ، وەك:( هیپارین، وۆرفارین Heparin, Warfarin)، کە بۆ نەخۆشی گیرانی بۆریەکانی خوێنی دڵ ومێشك وقاچ وهەندێ شوێنی تر بەکار دەهێنرێ.

کاریگەرە لابەلاکانی ئەو جۆرە دەرمانانە لەسەر دایك: خوێن بەربوونی منداڵدان، کەم کردنەوەی خەپڵەکانی خوێن، داخورانی ئێسقان.

کاریگەرە لابەلاکانی ئەو جۆرە دەرمانانە لەسەر کۆرپەلە: 3/2 حالەتەکان کرداری منداڵبوون زۆر ئاسایی بەڕێوەدەچێت وکۆرپەلەش باری تەندروستی ئاسایی یە، 5/1 حالەتەکان کۆرپەلەکە پێش وەختە لەدایك دەبێت، 8/1 حالەتەکان کۆرپەلە بە مردوویی دەبێت. [2]

ئەو حالەتانەی باسمان کردن زۆربەیان لە نەخۆشخانەکانی ناو کوردستان ودەرەوە چارەسەر دەکرێن پلۆژانە بۆیە پێویست بە لەباربردن ناکات.

ئەو حالەتانەی کە کۆرپەلە مردووە، دەتوانین بە هۆی نەشتەرگەری قەیسەری یان ڕاکێشان کۆرپەلەکە دەربهێنین، واتە لەباربردنی بۆ دەکەین چونکە مردووە هیچ کێشەیەکی پزیشکی وهیچ سزایەکی شەرعی لەسەر نیە. ئەگەر لەباربردنی بۆ نەکرێت لە کاتی دروستدا ئەوا بۆگەن دەکات وکێشە بۆ دایکەکە دروست دەکات.

---

*1 _ Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 416-417,436-437.*

*2 _ Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 625.*

د- شێرپەنجەو دەرمانی دژی شێرپەنجە: دەرکەوتنی شێرپەنجە کار دەکاتە سەر کرداری پیتێن وخولقانی کۆرپەلە، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر کۆئەندامی زاوزێ، یان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەهۆی کاریگەری لەسەر ڕژێنەگلاندەکان

شێرپەنجە بە گوێرەی شوێنەکەی دەکرێت بە شوێنەواری و گشتی:

1- شوێنەواری (الموضعي): شێرپەنجەی منداڵدان کە لە تەمەنی 45 ساڵ بەسەرەوە تووشی ئافرەت دەبێت، زۆربەی لە 60 ساڵ بەسەرەوەیە. شێرپەنجەی هێلکەدان: کەمتر وایە ئافرەت تووشی بێت لە تەمەنی زاوزێ، زۆربەی لە 50-70 ساڵیدایە. کەواتە پەیوەندیان بە لەباربردنەوە نیە.

شێرپەنجەی ملی منداڵدان: تووشی ئافرەت دەبێت لەتەمەنی زاوزێ، لێرە هەموو هەوڵی پزیشکەکان بۆ ڕزگار کردنی دایکەکەیە. ئەگەر کۆرپەلە لە تەمەنی پێش 4 مانگی دابوو، ئەوا کاتی لێدانی تیشکی ئەتۆمی کە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکە بەکاردەهێنرێ وا دەکات کۆرپەلە لەبارچێت ودێتە خوارەوە، ئەگەر کۆرپەلە لە تەمەنی چوار مانگی بەسەرەوە بوو ئەوا بە کرداری بڕینی منداڵدان (شق الرحم- Hysterotomy) یان نەشتەرگەری قەیسەری کۆرپەلە دەهێنرێتە دەرەوە، پاشان تیشکی ئەتۆمی لێدەدرێت.

شێرپەنجەی مەمك: 25% ی ئەو جۆرە شێرپەنجانە لە تەمەنی زاوزێدا ڕوودەدات. لەباربردن هیچ ناگۆڕێ لە ڕێڕەوی نەخۆشیەکە. بۆیە پێویستە بڕیاری لەباربردن تاوتۆ بکرێت لەگەڵ نەخۆشەکەو هەڵسەنگاندنی بارە تەندروستی نەخۆشەکە.

2- شێرپەنجەکان بە گشتی و دەرمانی چارەسەری شێرپەنجە و تیشکی ئەتۆمی: ئەوانە هەموویان دەبنە هۆی نەزۆکی، یان پشێوی لە خولقانی کۆرپەلە، یان لەبارچوونی ئاسایی، یان لەباربردنی چارەسەری بۆ ڕزگار کردنی دایکەکە، یان کۆرپەلەکە شێواوەکی بۆماوەیی یە، لەوکاتەدا بە گوێرەی پلەی شێواویەکە

مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین. لە لاپەڕەکانی داهاتوو باسی دەکەین. لەوانەشە کۆرپەلە بە شێوەیەکی دروست بێت وبە ئاسایی وبەسەلامەتی لەدایك دەبێت.[1]

**دووەم: ئەگەر ئەو سك پڕیە بەردەوام بێت، ئەوا لە دوای خۆی ئافرەتەکە بە تەندروستیەکی نالەبار جێ دەهێڵێت.**

ئەو جۆرە کاریگەرە شتێکی گومانلویەو ئەگەری تیایە، واتە لە ڕاستەقینەو یەقینەوە دوورە، ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە زۆربەی ئەو حالەتانەی ئافرەت تووشی تەندروستیەکی نالەبار دەکەن چارەسەر دەکرێن. هەندێ لەو نەخۆشیانە وەك بەرزی پەستانی خوێنی توندی پیس گەر چارەسەر نەکرێت ئەوا ئافرەت تووشی پەککەوتنی گورچیلەو دڵ دەبێت، ئەوەش لە ئەنجامی کەمتەرخەمی چارەسەرە، بۆیە لەباربردنی هیچ پاساوێکی شەرعی نیە.

**سێیەم: ئەگەر ئافرەتەکە منداڵی شیرە خۆرەی هەبوو ئەوا ژیانی دەکەوێتە مەترسیەوە**

ئەو بیرۆکەی وا باوبوو کەوا سك پڕی دەبێتە هۆی ووشك کردنی شیری دایك لە زانستی پزیشکی هیچ بنەمایەکی نیە، چونکە هۆرمونەکانی سك پڕی دژایەتیان نیە لەگەڵ کرداری شیر بەرهەم هێنان وهۆرمونەکانی. هەروەها سك پڕی لە ئافرەتی تەندروستی تەواو وا ناکات ئافرەت زۆر لاوازو بێ هێز بکات کە نەتوانێ شیری منداڵەکەی بدات ، تەنها ئەوەندەیە بڕی شیرەکەو جۆرەکەی دەگۆڕێ نابێتە خوراکێکی سەرەکی بۆ منداڵەکە.

لێرەوە دەپرسین ئایا گۆڕانی بڕو جۆری شیرەکە پاساوەکی پزیشکی وشەرعیە بۆ لەباربردنی کۆرپەلەو لەناوبردنی نەفسێکی بێ تاوان؟

*1 — Stuart & Ash.Manga. Gyaecology by ten teachers. P: 150- 151.*
*- Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 625,634, 664–663.*

**چوارەم: ئەگەر پزیشك وای گومان برد کەوا ئەو کۆرپەلەیە بە شێواوی بۆماوەیی(یولد مشوّهاً) لەدایك دەبێ وکەس نیە شیری بداتێ وخزمەتی بکات.**

## ئەو نەخۆشیانەی وا دەکەن کۆرپەلە شێواو بێت لە زگماکیەوە زۆرن، لەوانە:

### 1- نەخۆشیەکانی ڤایرۆسی ومیکرۆبی:

* کەم بوونەوەی بەرگری وەرگرتەی لەش.
* ڤایرۆسی خوریکەی ئاوی (جدري الماء- الحُماق --Varicella (Chickenpox
* تامیسکەی سادە (العقبولة البسيطة -Herps simplex)
* نەخۆشی پشیلە(داء المصورات الذيفانية- المقوسات-داء القطة- (Toxoplasmosis
* کەم بوونەوەی بەرگری وەرگرتەی لەش (AIDS)

ئەگەر ئافرەتەکە هەلگری ڤایرۆسی ئەیدز(HIV) بوو ئەوا ئەگەری تووش بوون کۆرپەلە بەو نەخۆشیە دەگاتە50%.

کاریگەری ئەو ڤایرۆسە لەسەر کۆرپەلەکە بریتیە لە: لەدایك بوونی پێش وەخت، کەمی کێشی کۆرپەلە کەمتر لە2500 گرام، لەکاتێکدا کێشی منداڵی ئاسایی 3500 گرامە، چیوەی سەری کۆرپەلە بچوکترە لە ئاسایی، 4% لە منداڵانە پاش یەك ساڵ دەمرن.

کاریگەری ئەو ڤایرۆسە لەسەر دایکەکە بریتیە لە: رێژەوی نەخۆشیەکە زیاد دەبێت، 72% نیشانەکانی دیار ناکەوێت، 12.6% هاوسانی لیمفە گلاندەکانی پێوە دیارە، 1.9% هەوکردنی بەکتیریاو قارچکی ناو دەم، 5.8% نیشانەکانی نەخۆشی ئەیدزی راستەقینەی دیاردەکەوێت.

رێژەی ئەو منداڵانەی بەهۆی ئەیدز دەمرن لە تەمەنی 1-4 ساڵ دەگاتە 83%، کە لە دایکیانەوە ئەو نەخۆشیانەیان بۆ گواستراوەتەوە. ئەوەش پلەی نۆیەمی

هۆکاری مردنی منداڵانە لە ئەمەریکا.[1]

ئەو نەخۆشیە دوای لە دایك بوونیش دەگوازرێتەوە لە ئافرەت بۆ منداڵەکەی لە رێگەی شیرەوە، بۆیە وا ئامۆژکاری دەکەین کەوا دایك شیری نەداتە منداڵەکەی.[2]

دوای روون کردنەوەی ئەو ڕاستیانە، دەتوانین بڵێین کەوا لەباربردن جائیز نیە چونکە رێژەی تووش بوون تەنها 50٪، ناتوانرێ بزانین کامەیان تووش بوونەو کامەیان تووش نەبووە. هەروەها ئەگەری لاوازی دایك بەو شێوەیە نیە کرداری لەباربردنی بۆ بکرێت.

### • ڤایرۆسی خوریکەی ئاوی

ئەگەر ئافرەت لە سەرەتای سك پڕی تووشی ئەو نەخۆشیە بوو، ئەوا بە رێژەی 0.7 % کۆرپەلە تووشی نەخۆشی زگماکی دەبێت، ئەگەر لە هەفتەی 13-20 تووشی ئەو نەخۆشیە بوو ئەوا 2٪ ی کۆرپەلە تووشی ئەو نەخۆشیە دەبن. ئەو نیشانانەی کە لەسەر کۆرپەلە بەدیار دەکەوێت ئەمانەن: کێشی کەمە، سەرو مێشکی بچوکترە لە قەبارەی ئاسایی، چاوی ئاوی سپی هەیە، پێستەشی تووشی ئاگرە سوورە دەبێت.

ئەگەر ئافرەتەکە دوای مانگی چوارەم تووشی ئەو نەخۆشیە بوو ئەوا کۆرپەلەکەی تووشی ئاگرەسوورەکی توند دەبێت.

ئەگەر ئافرەتەکە تووشی ئەو نەخۆشیە بوو 5 رۆژ پێش منداڵبوون یان دوو رۆژ دوای منداڵبوون ئەوا منداڵەکە تووشە خوریکەی ئاوی دەبێت لە تەمەنی 5-10 رۆژیدا. ئەو رێژە کەمەش نابێتە پاساو بۆ ئەوەی لەباربردن ئەنجام بدرێت، نیشانەکانی نەخۆشیەکەش زۆر قورس نیە تاوەکو دایك وباوك نەتوانن خزمەتی بکەن.

---

*1 — Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 368-372.*

*2 — Sheldon.H.Cherry. Complication of Pregnancy. P: 372.*

### * ئامیسکەی سادە

کاتی ئافرەتی سك پڕ تووشی ئەو نەخۆشیە بوو ئەوا لە 30-50٪ی کۆرپەلە تووشی هەندێ لە نیشانەکانی ئەو نەخۆشیە دەبێت وەك، هەوکردنی جگەر وپێستەو چاوو دەم ومێشك. ئەو ڕێژەی تووش بوونە، ئەو نیشانانە نابنە پاساوێکی پزیشکی وشەرعی بۆ لەناوبردنی کۆرپەلە.

بەڵام تووش بوونی کۆرپەلە بەو نەخۆشیە لەکاتی تێپەڕبوونی بەناو کۆئەندامی زاوزێدا زۆر ترسناکترە لەوەی لەکاتی بوونی کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا. ئەو جۆرە ترسناکەش پەیوەندی بە سك پڕیەوە نیە، چونکە کۆرپەلە کاتی هاتنە دەرەوەی تووشی ئەو نیشانانە دەبێت. بۆ بەرگری ئەوەش باشترین ڕێگە ئەوەیە کۆرپەلەکە بە نەشتەرگەری قەیسەری دەربهێنرێ نەوەك بە لەدایك بوونی سروشتی.

### * نەخۆشی پشیلە

تەنها 0.3-1٪ ی ئافرەتانی سك پڕ تووشی ئەو نەخۆشیە دەبن، تەنها 45-60٪ ی کۆرپەلەکان تووشی ئەو نەخۆشیە دەبن ئەگەر لە چوار مانگی یەکەمی سك پڕی بوو، گرنگترین نیشانەکانی بچوکی کاسەی سەرو مێشك، ئاوسانی مێشك، هاوسانی تۆڕەی چاو. ڕێژەی تووش بوونی ئافرەتی سك پڕ زۆر کەمەو تەنها 45-60٪ ی ئەوانە تووشی نیشانەکانی ئەو نەخۆشیە دەبن. ئەو پاساوانە نابنە هۆکار بۆ ئەوەی لەباربردن ئەنجام بدرێت.

### 2- نەخۆشیەکانی بۆماوەیی

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بە ڕوودانی نەخۆشیە بۆماوەکان کردووە، کە بەهۆی هەڵبەزینی بۆماوەکان(طفرة الجینات -الموروثات- العروق) ڕوودەدات.

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی فێر کردووە کە کاتی تای گەرم وئازار ئەو فەرموودەیە بڵێین: (( بەناوی خوای گەورە، پشت بەخوای گەورە، لە شەڕی هەموو بۆماوەیەکی سەرپێچ وتوندو بەئازار، لە شەڕی گەرمی ئاگر))

:((باسم الله الكبير،أعوذ بالله العظيم، من شرّ كل عرق نعّار[1] ، ومــن شــرّ حــر النار)).[2]

لــە حوجــاجی کــوڕی فەرافیــسەﷺ[3] دەگێڕنــەوە، کــەوا پێغەمبــەری خــواﷺ فەرموویەتی: (( هەر نەخۆشێك ئەگەر لـە کـاتی نەخۆشـیەکەی بڵێـت: سـتایش بـۆ زاتی تۆ ئەی خوای گەورەو خاوەن دەسەلات، پاك وبەزەیی، کـە هـیچ هاوبەشـێکت نیە، ئاساییکەرەوەی هەموو ڕەگ وبۆماوە سەرلێ شێواوەکان، خەو دەنێری بۆ ئەو چاوانەی لە شەونخونی دان، ئەوا خوای گـەورە شـیفای بـۆ دەنێـرێ)).((مــا مــن مريض يقول: سبحان الملك القدوس الرحمن الملك الدّيان، لا إله إلا أنــت مُــسكّن العروق الضاربة، ومنيم العيون الساهرة. إلا شفاه الله تعالى)).[4]

پێغەمبــەری پێــشەوا پــێش زانــستی پزیـشکی بــە 1400 ســاڵ ئامــاژەی بــە نەخۆشیەکانی بۆماوەیی کردووە، بەڵام لەبەر دووری موسڵمانان لـە ئـاینی خۆیـان بێ باوەڕان پێش ئێمە ئەو جـۆرە نەخۆشـیانە دەدۆزنـەوە، پـاش مانـدوو بـوونێکی زۆرو خەرجیەکی زۆریش، ئێمەش لەبەر دەستی خۆمانەو پـشت گوێمـان خـستووە، بۆیە وا دواکوتووین لەگشت زانستێکدا.

جـائیز نیـە لـەباربردن بـۆ هـەموو نەخۆشـیەکانی بۆمـاوەیی، بـەڵکو پێویـستە پۆلینیان بکەین ونیشانیان بکەین تاوەکو بڕیاری دروست لەسەر هەرجۆرێیان بدەین بەتەنها:

1- زۆربەی ئەو کۆرپـەلانەی کە تووشی نەخۆشی بۆماوەیی دەبن منداڵدان خۆی فڕێیــان دەدات، واتــە دەبێتــە لەربارچــوونی ئاســایی. ئــەو جــۆرە لەبارچــوونەش

---

1ــ نعّار :(عاصي. نعر الرجل: سەرپێچی کردوو ڕازی نەبوو. هەڵچوون، توندی ویـەئازار. بـەواتای ئەوەش دێت هیچ فیتنەیەك نیە گەر فلان کەس دەستی تیا نەبێ، واتە پێی هەڵساوە، پیاوێکی فیتنەبازە. ابن منظور، لسان العرب، 200/14 .

2 ــ سنن ابن ماجة ،باب: ما يعوذ به من الحمى، الرقم:3562، 1165/2. والأزدي، معمــر بن راشد ،الجامع لمعمر الأزدي، 19/11.

3 ـــ حجاج بن الفرافصة الباهلي: دوای ساڵانی 40ك وەفـاتی کردووە، ئیبن سیرین وعەتا لێیان گێڕاوەتەوە. الذهبي، أعلام النبلاء، 78/7.

4 ــ المنذري، عبد العظيم عبد القوي، الترغيب والترهيب، الرقم: 5286 ، 168/4.

ڕێژەکەی دەگاتە 50-60٪ ی لەبارچوونەکان، ئەوەش پێش مانگی دووەمی سك پڕی ڕوودەدات، واتە پێش خولقاندنی ئەندامەکان وهاتنەبەری ڕوح. ئەو جۆرە لەبارچوونە لەگەڵ بوونی ئەو نەخۆشیانە خۆی بە شێوەیەکی خۆنەویست ڕوودەدات، ئەوەش ڕەحمەتێکە لەلایەن خوای گەورەوە تاوەکو دایك و باوکەکە نەکەونە نا ڕەحەتی وماندوو بوون.

2- زۆربەی نەخۆشیە زگماکەکان کە بە هۆی زیاد بوونی یان کەم بوونی کرۆموسومێك یان چەند کرۆموسومێك، بۆماوەیەك یان چەند بۆماوەك ڕوودەدات، ئەوا کۆرپەلەکە بە شێوەیەکی ئاسایی دەبێ ودەگاتە تەمەنی زاوزێ وژیانێکی تا ڕاددەیەك ئاسایی دەژیت، تەنها پشێوی هەندێ ئورگانی هەیە، وەك: ( کلاین فلتر- XXY)، تیرنر سندرۆم ( تناظر- XO). کەواتە لەباربردن جائیز نیە لەسەر گومانی پزیشکان کە کۆرپەلەکە شێواوە.

3- کاتێ پشێوی لە کرۆموسومەکانی جەستەیی ڕوودەدات، ئەوا پشێوی لە دەماغ ودڵ کۆرپەلە ڕوودەدات، زۆربەیان دەمرن دوای یەك ساڵ، هەیانە دەگەنە تەمەنی زاوزێ وەك: داون سیندرۆم (تناظر داوون-Downs syndrome 21Triosomy )، نەخۆشی مەنگۆلی ( Mongolism) ، نەخۆشی ئیدوارد Edwards syndrome)) ، کەم خوێنی دەریایی- فاقةالدم البحریة- (Thalassaemia [1]

دەربارەی ئەو جۆرە نەخۆشیانە: جائیز نیە لەباربردنی ئەنقەست، چونکە وەك کوشتنی نەفسێکی بێ تاوانە، لەبەرئەوەی ئەو نەفسە دوای لەدایك بوون چەند ساڵێك دەژیت و، پاشان خۆی دەمرێت بۆچی ئێمە پەلە لە مردنی بکەین. هەروەها بۆ هەموو ئادەمیزادێك، خوای گەورە ڕزق وڕزی وئەجەلی بۆ داناوە ج کورت ج درێژ، کەواتە پێویست بە دەست تێوەردانی ئادەمیزاد ناکات. لەوانەشە کۆرپەلەکە بە لەشێکی دروست وئاسایی لەدایك ببێت دوور لە هەموو پێشبینیەکانی دکتۆرەکان.[2]

*1 —— Hunter JAA. (2005).Davidsons Principle&Practice of Medicine. P:340-342.*

2ـ الأشقر، محمد سليمان، أبحاث اجتهادية في الفقه الطبي، ص45-46.

4- بەڵام دەربارەی ئەو نەخۆشیە بۆماوەیانەی کە زۆر قورس وترسناکن وەك: کۆرپەلەی بێ کاسەرو مێشك ( Anencephaly) ، ئیفلیجی لەرزۆك (الشلل الرعاشي- Parkinsonis disease).

بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان لەباربردن وئەو نەخۆشیە بۆماوەیانە ئەو خاڵانە دەخەینە ڕوو.

بەگشتی ئەو حاڵەتانەی کەوا ماندوویی و کێشەی وژیانێکی پڕ مەینەتی بۆ خێزانی ئەو کۆرپەلە ئەنێتەوە لە داهاتوو، بەتایبەتی ئەوانەی کەوا پشکنینی پزیشکی دەری خستووە کەوا تووشی شێواوی عەقلی وجەستەی قورس دەبن، ئەوا لەباربردن جائیزە پێش40 ڕۆژ لە تەمەنی کۆرپەلە، ئەوەش لە دەروازەی فیقهی: بەستانی ڕێگەی پاساودان- پاساو نەدان، بەرگری زیان بەپێی توانا، بەڵام دوای هاتنەبەری ڕوح، ئەگەر دایکەکە تەندروستی باش بوو، ئەوا کۆرپەلە یان دەمرێت و بەلەباربردنی چارەسەر دەردەهێنرێ، یان بە زیندوویی لە دایك دەبێت وخۆی دوای ماوەیەك دەمرێت، کەواتە پێویستمان بە لەباربردن نیە لە هەردوو حاڵەتدا.

پێنجەم: کۆرپەلەکە بە نەشتەرگەری لەدایك دەبێ، یان دایکەکە بە بێ هێزی و کەم توانای دەهێڵێتەوە.

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی پزیشکی ئەو جۆرە نەشتەرگەریانە زۆر ئاسان بووە، پلەی ئەگەری تووش بوونی دایك بە بێ هێزی و کەم توانایی ئەوا لە شتە گومانایەکانە، بۆیە نابنە پاساوی زانستی بۆ لەباربردنی چارەسەری. ئەگەر ئەو کاریگەرە لابەلایانەش ڕوویدا ئەوا چارەسەری ئاسانە.

#### پوختەی باسەکەو ڕای نووسەر

1- بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی ڕوونمان کردەوە، دەردەکەوێت کەوا ڕێژەی ئەو نەخۆشیانە لە ئافرەتی سك پڕ وڕێژەی تووش بوونی کۆرپەلە بەو نەخۆشیانە نزمە، هەروەها ئەو حاڵەتانەی کۆرپەلەش تووش دەکات نیشانەکان وکاریگەرە لابەلاکانی ناگاتە ئەو پلەیەی کەوا لەباربردنی بۆ ئەنجام بدرێت لە جۆری لەباربردنی

چارەسەری، مەگەر بە دەگمەن نەبێت هەروەك باسمان كردن. ئەوەش لەبەر پێشكەوتنێكی بەرچاوی زانست وتەكنۆلۆژیای پزیشكی، ئەو پشكنین وئەزمایشتانەی دەكرێت بۆ ئەو حالەتانەی ئەگەری ئەوەی لێدەكرێت كە كۆرپەلە تووشی بەم جۆرە نەخۆشیانە بێت، وای كردووە زۆر لەو نەخۆشیانە دیاری بكرێن وچارەسەر بكرێن نەگاتە ئەو پلەی كە لەباربردنی بۆ ئەنجام بدرێت وەك چارەسەرێك.

2- ئەگەر دایك كاتی سك پڕی تەندروستی باش بوو، ئەوا بەردەوام دەبێت لەسەر سك پڕیەكەی تاوەكو منداڵەكەی دادەنێت، ژیانی ئەو كۆرپەلە لەدایك بووەكەش لە دەست خودایە، هەم ڕزق وڕۆزی وهەم تەمەنی.

3- ئەگەر كۆرپەلە تەواو بوو لە ڕووی تەمەن وتەندروستی، بەڵام بووە هۆی ئەوەی مەترسی بۆ ژیانی دایكەكە دروست بكات، بەمەرجێ ئەو مەترسیە ڕاستەقینەیەكی پزیشكی بێت نەوەك گومان، ئەوا لەو كاتەدا دەتوانین بڕیاری هەڵبژارد بدەین، ژیانی كامەیان پێویست ترە ئەو هەڵدەبژێردرێ بۆ ڕزگار كردن.[1]

ئیمامی غەزالی دەڵێ: ئەگەر دوو شتی جیا كەوتنە بەرامبەر بەیەك، وەك جائیز و حەرام، ئەوا هەڵبژاردن دەكرێت، بۆ نموونە پیاوێك دوو منداڵی شیرەخۆرەی هەبوو، ئەگەر شیرەكەی بدایە هەردووكیان ئەوا تێریان نەدەخواردو دەمردن، ئەگەر بیدا بەیەكیان ئەوا ئەوەی تریان دەمرێ، كەواتە ئەگەر شیرەكە بداتە یەكیان ئەوا تێر دەخوات ودەژی ئەوا واجیبەو جائیزە، بەڵام لەلایەكی ترەوە حەرامە چونكە منداڵەكەی تر بەو هۆیەوە دەمرێت. لێرەدا هیچ ڕێگە چارەسەرێك نیە تەنها هەڵبژاردن نەبێت لە نێوان ئەو دوو منداڵە بۆ ئەوەی هەردووكیان نەمرن لەیەك كاتدا، بەڵكو یەكیان بژیت لەسەر مردنی ئەوی تریان.[2]

---

1ـ العز الدين بن عبد السلام، قواعد الأحكام في مصالح الأنام، 75/1.

2ـ الغزالي، أبو حامد، المستصفى، 381/2.

موحەمەد رەمەزان بوطی دەڵێ: نابێت هیچ پزیشکێك کۆرپەلە لەبارببات دوای 120 ڕۆژ مەگەر بۆ ڕزگار کردنی دایکی نەبێت. چونکە هەمووان دەزانین بەرژەوەندی مانەوەی دایك لە پێشترە لە کۆرپەلە، چونکە ژیانی کۆرپەلەی بێ دایك خۆی لە مەترسیە بۆیە دایکەکە بە پێش دەخرێت.[1]

یوسف قەرزاوی دەڵێ: ئەگەر ئەو دوو بەرژەوەندیە کەوتنە بەرامبەر بەیەك، ئەوا بەرژەوەندیە سەرەکی وئەسڵەکە کە –دایکە– ناکرێتە قوربانی بەرژەوەندی لق ولاوەکیەکە کە منداڵەکەیە. [2]

---

[1] البوطي، تحديد النسل، ص74، 106.
[2] القرضاوي، فتاوى المعاصرة، 2/595.

# بەشی پێنجەم

# منداڵبوون وزەیستانی وشیر پێدان

## ( الولادة والنفاس والرضاعة )

## ( Labour, postpartum, Breast feeding ))

باسی یەکەم : منداڵ بوون وزەیستانی

باسی دووەم : شیر پێدان

# باسی یەکەم

# منداڵ بوون وزەیستانی

# ( الولادة والنفاس )

بەندی یەکەم : منداڵبوون

بەندی دووەم : زەیستانی

بڕگەی یەکەم : واتای زەیستانی

بڕگەی دووەم : زەیستانی لە ڕووی پزیشکیەوە

بڕگەی سێیەم : زەیستانی لە ڕووی شەرعەوە

بڕگەی چوارەم : پاداشتی زەیستانی

## بەندی یەکەم: منداڵبوون

واتاکەی:(ولد: ولَدتِ المرأة: منـداڵی بـوو: وِلاداً ووِلادة وأولَدَت: حان وِلادُهـــا. کاتی منداڵبوونی هات. کاتی دانانی سك پڕیەکەی هات)[1].

قۆناغی کۆتایی سك پڕیە، بەسێ قۆناغدا دەڕوات:

1- قۆناغی ژان هاتن (مرحلة المخاض): کرژبوونەوەی ماسـولکەکانی منداڵـدان بەمەبەستی دەرهاویشتنی کۆرپەلە، ئەوە قۆناغی پێش منداڵبوونەو نزیکەی 8-12 سەعات دەخایەنێ، هەشت سەعات بۆ ئافرەتێك پێشتر چەند منـاڵی بووبێ (المرأة الولودة-عديدة الــولادة Multi gravida)، 12 سـەعات بـۆ ئافرەتێـك کـە سـکی نۆبـەرەی بـێ (المرأة التي تلد للمرة الأولى- Primi gravida). هەنـدێ جـاریش زیاتر دەخایەنێ.[2]

2- قۆناغی دەرهاویشتن (مرحلة الانقذاف): لەو قۆناغەدا کۆرپەلە دێتە دەرەوە بە ناو کۆئەندامی زاوزێ دا، ماوەی ئەو قۆناغە دیـاری دەکرێـت بـە هـۆی قـەبارەی منداڵەکەو قەبارەی دایکەکە. کـرداری دەرهاویـشتنی کۆرپـەلـە بـە هـۆی کرژبـوونی ماسولکەکانی منداڵدان وخاو بوونەوەی ماسولکەکانی ملی منداڵدانەوە دەبێت.[3]

3- قۆناغی ڕزگـار بـوون (مرحلة الخلاص): لـەو قۆناغـەدا هـەموو پاشـکۆکانی بەندە بە سك پڕی دێنە دەرەوە، ئەو کردارە تەنها 10-15 خولەك دەخایەنێ.[4]

کرداری منداڵبوون ئازارێکی زۆری لەگەڵدایە، کە هیچ ئێش وئازارێك بە ئەندازەی ئەو ئازارە نابێت. هـەروەها لەوانەیـە لـەو کـردارەدا ملـی منداڵـدان، ماسـولکەکانی نێـوان کـۆم وزێ پـچڕانی تـێ بکـەوێت، هـەروەها ئەگـەری ئـەوەش هەیـە کـرداری

---

1 ــ ابن منظور، لسان العرب، 393/15.

2 ـ*Stuartl & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 115.*

3 ـ *Stuartl & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 116*

4ـ *Stuart l& Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 117.*

- أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص112، والبار، خلق الإنسان ، ص454-456.

منداڵبوونەکە وا بە ئاسانی نەبێ و بێتە منداڵبوونی ئاڵۆزو ناڕەحەت (الولادة العسيرة).

## بەندی دووەم: زەیستانی

### بڕگەی یەکەم: واتای زەیستانی

أ- زەیستانی لە زمانەوە (النفاس): (منداڵ دانانی ئافرەت. فهي نَفساء، ونَفِسَت المرأة ونَفِسَت، نَفساً ونَفاسَة وهي نَفساء ونُفَساء ونَفَساء: ولدت. وقال ثعلب: النُفساء سك پڕی، منداڵبوون، بێ نوێژی، والجمع من كل ذلك: نَفَساوات ونِفاس ونُفاس ونُفَس. ونُفِسَت المرأة: بێ نوێژ بوو- حاضت).[1]

ب- زەیستانی لە ڕووی زاراوەیی: (ئەو خوێنەیە کە لە دوای منداڵبوونەوە دەردەچێت، یان پێش منداڵبوون بە کاتەکی کەم، یان لەگەڵی ڕاستەوخۆ، یان لە دوای بە ماوەیەکی کەم.[2]

ج- ماوەی زەیستانی: (کەمترینی یەك ساتە، زۆرەکەشی60 ڕۆژە، زۆربەی ئافرەتان 40 ڕۆژ زەیستانی دەبن).[3]

لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕنەوە دەڵێت:((زەیستانی لە کاتی سەردەمی پێغەمبەری خوا40 ڕۆژ دادەنیشت)). ((كانت النفساء تجلس على عهد رسول الله ﷺ أربعين يوماً)).[4] ئەوەش لەسەر زۆرینەیە، ئەوەش واتای ئەوە نیە کە زیاتر نابێت.[5]

ژمارەی ڕۆژەکانی بێ نوێژی وزەیستانی وپاك بوونەوەی ئافرەت زیاتر پەیوەستە بە بە خوێندنەوەی کرداری(الاستقراء)، واتە بە دواچوونی ڕووداوەکان وبوونیان بەبەردەوامی ئەوە دەسەلمێنێ.

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 14/237-238.
2ـ الفقه على المذاهب الأربعة، الجزيري، 1/131. والتهذيب في أدلة متن الغاية، ص37.
3ـ التهذيب في أدلة متن الغاية، ص37، وسراج الوهاج، النووي، ص34.
4ـ الترمذي، محمد بن عيسى، باب: كم تمكث النفساء، الرقم:139، 1/256.
5ـ الشوكاني، نيل الأوطار، 1/348. ومسند الإمام أحمد بن حنبل ، الرقم:26626، 6/302.

## بڕگەی دووەم: زەیستانی لە ڕووی پزیشکیەوە

ئەو ماوەیە کە دوای منداڵبوون دێت. هەر لەو کات هەندێ خوێن وشلەی تر دێتە خوارەوە. پاشان منداڵدان دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی. ئەو ماوەیە 40 ڕۆژ دەخایەنێ، لەوانەیە بگاتە 6 هەفتە.[1]

منداڵدان کێشی کە گەیشتووتە 1000 گرام کاتی سک پڕی بێجگە لە پاشکۆکانی، دادەبەزێ بۆ 500 گرام پاش7 ڕۆژ، 250 گرام پاش 14 ڕۆژ، ئەو دابەزینە بەردەوام دەبێت تاوەکو کێشی دەگاتە 50 گرام پاش40 ڕۆژ. ئەستووری دیواری منداڵدان لە کاتی ئاسایی1 سم دەبێت، کاتی سک پڕشی دەگاتە 5 سم، لە ماوەی زەیستانی دەگەڕێتەوە سەر ئەستووری خۆی ودیواری ناوەشی دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی.[2]

ئەو شلەی دێتە خوارەوە کاتی زەیستانی پێی دەڵێن (النفاسة- مفرزات النفاس - Lochia)، لە 3-4 ڕۆژی یەکەمدا ڕەنگی سووری تۆخە، پەیتە، هەندێ دەنکۆکەی مەیوی تیایە (Necrotic decidu)، پاشان بەرەو ووشک بوونەوە دەڕولو ڕەنگی بەرەو پەمەیی دەڕوانێ و ماددەی چڵمنی(المخاطية) لەگەڵدایە، لە کۆتایدا ڕەنگی سیرەم (serum) وەردەگرێ، ئەوەش مانای کۆتایی زەیستانیە.[3]

ئافرەتی زەیستان هەست بە ماندوو بوون ولەرزین ودابەزینی پلەی گەرمی دەکات بۆ ماوەی چەند سەعاتێك، دوای بەرەو بەرزی دەڕوات، پاشان دەگەڕێتەوە باری ئاسایی دوای چەند ڕۆژێك.[4]

نیشانەکانی زەیستانی ونیشانەکانی سك پڕی کە لە پێشەوە باسمان کرد، وا لە ئافرەت دەکات بۆ ماوەی یەك ساڵ باری تەندروستی تەواو جێگیر نەبێت، هەرکات

*1— Stuart & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P:141.*

*2 — Stuart & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers . P: 142.*

*- Stuart & Cristoph lees. Obstetric by ten teachers P: 142.*

3 -أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص105. والبار، خلق الإنسان ، ص462-465.

*4— Stuart&Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 142.*

ئەو ماوەیە بەسەر چوو ئەوا هەرگیز ناگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی بە هیچ شێوەیەك. ئەو كارانەی كە پێشتر ئەنجامی دەدا ناتوانێ دوای بەسەر چوونی ئەو ماوەیە ئەنجامی بدات.

## بڕگەی سێیەم: زەیستانی لە ڕووی شەرعەوە

حوكمی زەیستانی هەروەك حوكمی بێ نوێژی وایە لە هەموو شتێكدا، هیچ خیلاف نیە لە نێوان زانایان. ئەوەڕای شافعیەكان[1] ومالیكیەكان[2] وحەنبەلیەكانە.[3]

دەست لە قورئان نادات وقورئان ناخوێنێ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی كە جابری كوڕی عبد الله ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواﷺ:(( لا يقرأ الحائض ولا الجنب ولا النفساء القرآن)).[4]

سەرجەمی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن كەوا زەیستانی وەك بێ نوێژیە لە هەموو حوكمەكانی حەرامی وحەلالی، هەروەها بێ نوێژ، نوێژ ناكات.[5]

دەركردنی حەددە شەرعیەكان دوا دەخرێت لە سەر ئافرەتی زەیستانی، نەوەك بمرێت، بەبەڵگەی ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی عەلی كوڕی ئەبو تالیبی ﷺ نارد بۆ جەلد كردنی ئافرەتێك كە لە نوێ زەیستانی ببوو، ئەویش دوای خست لە ترسی ئەوەی كە بەرگە نەگرێت، ئەویش فەرمووی: ((باشت كرد))((أحسنت)).[6]

---

1ـ ابن قدامة ، المغني ، 120/1.

2 ـ الدسوقي، محمد عرفة، حاشية على الشرح الكبير للدردير، 175/1. والصاوي، حاشية الصاوي81/1.

3 ـ ابن قدامة، المغني، 337/1 و 350/1.

4 ـ دار القطني البغدادي، سنن دار القطني. باب:نهي المحدث عن مس القرآن. الرقم: 15، 121/1.

5 ـ الشوكاني، نيل الأوطار، 1/ 348.

6 ـ صحيح مسلم بشرح النووي، 214/11.

## زەیستانی و ڕۆژو

حیکمەت لە قەدەغە کردنی ڕۆژو لەسەر ئافرەتی زەیستانی: چونکە ئافرەت لە کاتی سك پڕی و منداڵبوون ماندوو بووە، ئێستاش شیردەداتە منداڵەکەی، بۆیە پێویستی بە خواردنی باش و بەردەوام وسووك هەیە کە هەموو ماددەکانی پرۆتین وکاربۆهیدرات وڤیتامینی تێدا بێ، تاوەکو شیری زۆربێ وتوانای بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی، ئەگەر بە ڕۆژو بێت ئەوا ئەو مەبەستانە نایەنە دی. لێرەوە دووبارەو دەبارە بەزەیی وخوای گەورە بەرامبەر بە ئافرەت وڕێزگرتنی لە ئافرەت وڕەچاوکردنی کاتە تایبەت وناڵەبارەکانیمان بۆ دیاردەکەوێت. و الله أعلم.

## بڕگەی چوارەم: پاداشتی زەیستانی

لە عیبادەی کوڕی سامت ﷺ[1]، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( خۆ بەخت کردن لە ڕێگەی خوا، نەخۆشی سك، لە ناو خنکان، زەیستانی هەموویان شەهیدن)) ((القتل في سبيل الله شهادة، والبطن شهادة، والغرق شهادة، والنفساء شهادة)).[2]

---

1ـ عبادة بن الصامت بن قيس الخزرجي الأنصاري: لە هاوەڵە بەڕێزەکانە، یەکێکە لە نەقیبەکانی پەیمانی عەقەبە، هەموو غەزوەکانی دوای بەدری دیووە، لە فتوحاتەکان بەشدار بووە، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، ئیمارەت وقەزای وەرگرتووە لە شام، لە ساڵی 34ك لە رەملە کۆچی دوایی کردووە . ابن حجر، الإصابة، 625/3. والذهبي، سير أعلام النبلاء، 5/2.

2 ـ مسند الإمام أحمد، الرقم:26626 ، 310/2.

# باسی دووەم

# شیر پێدان

# (الإرضاع- الرضاعة)

بەندی یەکەم: پێکهاتەکانی شیری دایک

بەندی دووەم: جیاوازی نێوان شیری دایک شیری ووشك

برگەی یەکەم: جیاوازیە گشتیەکان

برگەی دووەم: جیاوازیە تایبەتیەکانی ناو پێکهاتەی شیر

بەندی سێیەم: سوودەکانی شیری دایک

برگەی یەکەم: سوودەکانی شیری دایک بۆ منداڵەکەی

برگەی دووەم: سوودەکانی شیرپێدان بۆ دایکەکە

بەندی چوارەم: حوکمەکانی شیرپێدان

واتای شیرپێدان: (مندالّەكە شیری خوارد، رَضَعَ الصبي وغيره يرضَع. يَرْضَعُ رَضْعاً ورَضَعاً ورَضاعاً ورِضاعاً ورَضاعَةً ورِضاعةً، فهو راضِع، والجمع:رُضَّع. والرضاعة، بالفتح والكسر: ناوێكة بۆ شیر ئێدان. الاسم من الإرضاع).[1]

ماوەی شیرپێدان ئەو ماوەیەیە كە ئافرەت بۆ خۆی نازێت بە تەنها، بەڵكو زیاتر لە نیوەی ژیانی بۆ ئەو خەڵاتەیە كە خوای گەورە بەو لوو هاوسەرەی بەخشیوە، ئەو خواردنەی ڕۆژانە دەیخوات هەرس دەكرێ وپوختەكەی دەبێتە شیرێكی پاك بۆ ئەو ئەمانەتەی كە خوای گەورە لایانی داناوە.

## بەندی یەكەم: پێكهاتەكانی شیری دایك ( حليب الأم )

چەوری: زۆر جۆری بەسوود هەیە لە شیری دایك، لەوان: 98% چەوری شیری دایك بریتیە لە سیانە گلیسراید بەتایبەتی جۆری (ئولیك ئەسید، پالمیتیك ئەسید، ئاراچیدۆنیك ئەسید..هتد) ئەمانە هەموویان زۆر پێویستن بۆ گەشەی مێشك وچاو، بەشێكی زۆریش پێك دەهێنن لە مێشكە خانەو دەمارەخانە. هەروەها ئەو چەوریانە بەسوودن بۆ گواستنەوەی زۆر لە ڤیتامین ومادده بەسوودەكانی تر، وەك (پرۆستاگلاندین وڤیتامین A,D,E,K). هەروەها 50% ووزەی ناو شیر لەو چەوریانە بەرهەم دێت.

پرۆتین: زۆر جۆری جیاواز لە پرۆتین لەناو شیری دایكدا هەیە، ناچینە ناو وردەكاریەكان وناوەكانیان بەدرێژی، بەڵام باسی گرنگیەكانیان دەكەین.

دوو جۆر پرۆتینی سەرەكی هەیە لە ناوشیردا، (كازین و وای – Casein &Whey)بە ڕێژەی 40:60.

Ig.A : بەرگری ناو ڕیخۆلە دەكات لە هێرشی بەكتریاو ڤایرۆسەكان.

لاكتۆفیرین: هاوكاری زیاد مژینی ئاسن دەكات لە ڕیخۆڵە، بەرگری دەكات دژی بەكتریا، سەرچاوەیەكی باشی ووزەیە.

كاربۆهیدرات: بەشی زۆری بریتیە لە جۆری لاكتۆز، كە ئەو سوودانەی هەیە:

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 232/5.

هانی گەشەی هەندێ بەکتریای بە سوود دەدات لە ڕیخۆڵە، هانی مژینی ئاسن و کالیسیوم دەدات.

ڤیتامینەکان: زۆربەی ئەو ڤیتامینانەی تیایە کە منداڵ پێویستیەتی بەتایبەتی ئەو ڤیتامینانەی لە ئاو دەتوێنەوە.

کانزاکان: هەموو ئەو کانزایانەی تیایە کە بۆ گەشەی منداڵ پێویستە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە وپەیوەست نیە بە جۆری خواردنی دایکەوە.

ئاو: تاوەکو تەمەنی شەش مانگ ئەو ئاوەی لەناو شیردا هەیە پێویستی منداڵ دابین دەکات، بۆیە پێویست نیە ئاو بدرێتە منداڵ پێش ئەو تەمەنە.

ئەوانەی لە سەرەوە باسمان کرد تەنها ئەومادەدانە بوون کەووزەیان دەبەخشی و سوودی تریان هەبوو، بێجگە لەوانەش هەندێ پێکهاتەی تر هەیە لەناو شیردا کە ووزەیان تیادا نیە بەڵام سوودی تریان هەیە، وەك:

فاکتەری دژ بە میکرۆبات، فاکتەر دژی هەوکردن، هۆرمونی جیاجیا، فاکتەری گەشە کردن، فاکتەروئینیزمی هەرس کردن، فاکتەری گواستنەوەی ماددە بەسوودەکان.

ئەوانەی باسمان کردن زۆر پێویستن بۆ ژیانی منداڵ بەتایبەتی لە تەمەنی ساوادا، چونکە ڕێکخەری هەرسی خواردن وتوانای هەرس زیاد دەکەن، هەروەها هۆکاری بەرگری لەش دژی هەموو جۆرە میکرۆبە زیان بەخشەکان زیاد دەکات.

هەروەك چۆن ئافرەت لە کاتی سك پڕی پێویستی بە خواردنی تایبەت هەبوو کە دەوڵەمەند بێت لە ڤیتامین وکانزاکان، ئەوا کاتی شیرپێدانیش بە هەمان شێوەیە. بەمەش ئافرەت پێویستی بە ووزەیەکی زیاتر هەیە کە ڕۆژانە دەگاتە نزیکەی 500 کیلۆ کالۆری. بڕی ووزەی پێویست بۆ ئافرەت وەستاوە لەسەر بڕی ئەو شیرەی کە ئامادەی دەکات، لەگەڵ بڕی ئەو ووزەیەی کە داکراوە (خزن) لەناو لەشیدا.

هەروەها پێویستی بە بڕی پرۆتینی زیاد هەیە دەگاتە نزیکەی 20 گرام ڕۆژانە، بە تایبەتی لە شەش مانگی یەکەمی شیر پێدان. هەروەها پێویستی بە بڕێکی

زیادی کانزای کالیسیوم وئاسن وڤیتامینیC,A,Bو ترشی فولیك وئاوی زیاد هەیە.[1]

## بەندی دووەم: جیاوازی نێوان شیری دایك شیری ووشك

### برگەی یەکەم: جیاوازیە گشتیەکان

1- شیری دایك هەمووکات ئامادەیەو لەپلەیەکی گەرمی دروست، پالاوتن وپاککردنەوەو تەعقیمی ناوێت.

2- ژمارەیەکی زۆر دژە تەنی تیایە(Antibodies).

3- منداڵ دەتوانێ بە ئاسانی شیری دایك هەرس بکات باشترو خێراتر لە شیری گیانەوەرانی تر.

4- هیچ ماددەیەکی دروست کرا، زیاد کراو، دەست کردی تیا نیە.

5- سوودەکانی دەرونی تیادا زۆرەبۆگەشەو جیگیری باری دەرونی لەدوارۆژ دا.

6- ئافرەتەکە کەمتر تووشی شێرپەنجەی مەمك دەبن.

7- بەهۆی شیرپێدان ماوەی نێوان سك پڕیەکان دوور دەکەونەوە ، بەمەش ئافرەت زیاتر باری تەندروستی خۆی ئاسایی دەکاتەوە.

### برگەی دووەم: جیاوازیە تایبەتیەکان ناو پێکهاتەی شیر

1- دوو جۆر پرۆتینی سەرەکی هەیە لە ناوشیردا، (کازین و وای - Casein &Whey) بە رێژەی 40:60. بەلام لە شیری ووشکدا رێژەی ئەو دوو پرۆتینە 80:20، ئەوەش وا دەکات پەستانی ناو ریخۆڵە زیاد بکا، گەدە زوتر بەتاڵ بێت، ئەوانەش هۆکارن بۆ دروست بوونی باوبۆو ئازاروگریانی منداڵ.

2- لە ناوشیری دایك پرۆتینی جۆری ئەلفا لەکتۆگلۆبین(Alfa-Lactoglubulin) هەیە، بەلام لە شیری ووشك بیتا لەکتۆگلۆبین (Beta-

---

*1 — Stuart&Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 143.*

- حسين أبو حامد ، مختصر فسيولوجيا ، ص310. ومحاضرات كلية الطب/ طلبة الدكتوراة.

Lactoglubulin) هەیە، ئەوەش هۆکاری دروست بوونی حەساسیەیە لە منداڵ بەرامبەر بە هەندێ خۆراك.

3- ڕێـژەی پرۆتینـی میسیونین بـۆ سیستین (Methionine/Cysteine) یەکسانە بە 1:1 لە شیری دایکدا، بەڵام لە شیری ووشکدا ئەو ڕێژەیە 2:3. هەروەك ئاشکرایە کەوا پرۆتینی (سیستین) زۆر پێویستە بۆ گەشەی منداڵ، کە دەبینین لە شیری ووشکدا بڕی ئەو (سیستین)ە زۆر نیە، جگەرو گورچیلەی منداڵی ساواش ئەو توانایەی نیە کە میسیونین بگۆڕێ بۆ سیستین، لە ئەنجامدا منداڵەکە لە جۆرە پرۆتینە بە سوودە بێ بەش دەبێت.

4- شیری دایك بڕێکی باشی لە پرۆتینی تۆرین(Taurine) تیایە، کە بەسوودە بۆ گەشەی مێشك وتۆڕەی چاو، پرۆتینی فینایل ئەلینیلی(Phenylanaline) تیا نیە کە زیان بەخشە، بەڵام شیری ووشك بە پێچەوانەیە.

5- ڕێژەی نایترۆجینی نا پرۆتینی(Non protein nitrogen) لە شیری دایکدا 25%، لە شیری ووشکدا تەنها 5%، کە ئەوەش بە سوودە بۆ گەشەو زیاد بوونی بەکتریا سوود بەخشەکانی ڕیخۆڵە، گەشەی مەمیلەکانی ناو ڕیخۆڵە، گەشەی مێشك، هەروەها یاریدەدەری هەندێ کارلێکە کیمیاویەکانی ناو خانەیە.

6- چەوریە زۆر پێویستەکان (Essential amino acids) بۆ گەشەی مێشك لە شیری دایك بە ڕێژەی 10%، لە شیری ووشك تەنها 2%.

7- شەکری لاکتۆز لە شیری دایکدا 6.8 گرام/ 100 میلیلترە، لە شیری ووشك 4.9 گرام/ 100 میلیلترە، کە مژینی کالیسیوم وئاسن زیاد دەکات، گەشەی بەکتریایە سوود بەخشەکانی ناو ڕیخۆڵە زیاد دەکا، بەرگری دەکات لە پێوەلکانی میکرۆبە زیان بەخشەکان بە دیواری چینی ناوەوەی ڕیخۆڵە.

8- لاکتۆز کاتی شیبوونەوەی دەبێتە گالاکتۆزو گلوکۆز، گالاکتۆز پێویستە بۆ

دروست كردنى گالاكتۆليپيد(Galactolipid) كە ئەويش پێويستە بۆ دروست كردنى خانەكانى مێشك.

9- بڕى ئۆليگۆسەكەرايد(Oligosacchride) لە شيرى دايك 10 هێندەى شيرى ووشكە، ئەوەش سەرچاوەيەكى ووزەى بەردەوامى لەسەرخۆيە، هەروەها گەشەى بەكترياية سوود بەخشەكانى ناو ڕيخۆڵە زياد دەكا.

10- بڕى ڤيتامينى A,C,E لە شيرى دايك زۆر زياترە لە شيرى ووشك.

11- بڕى كانزاكان لە شيرى ووشك زياترە لە شيرى دايك، بەلام مژينى كانزاكان وەك كاليسيوم و زينگ لە شيرى دايك باشترە، ڕێژەى مژينى ئاسن لە شيرى دايك 70% ولە شيرى ووشك تەنها 30%. كانزاى سۆديۆم لە شيرى ووشك زياترە هەربۆيە ئەوانەى شيرى ووشكيان خواردووە زۆرتر و زووتر تووشى بەرزى پاڵەپەستۆى خوێن دەبن (ليكۆڵينەوە كراوە لەو بارەيەوە، بەلام ئەنجامى جيا جياى داوە).

12- ڕێژەى خوێيەكانى ناو شيرى ووشك زياترە بە 2.5:1 ئەوەش بارگرانى لەسەر گورچيلە دروست دەكات بە تايبەتى كاتى هاوينە.

13- شيرى دايك بڕێكى زياترى ئينزيمى لايپەيزى(Lipase) تيايە، ئەوەش هاوكارە بۆ زوو شيكردنەوەى سيانە گليسرايد(TG) ومژينى لە ڕيخۆڵەكان.

14- لاكتۆفيرين ولايسۆزايم(Lactoferrin & Lysozyme & Ig.G )لە شيرى دايك زۆر زياترە لە شيرى ووشك، ئەوانەش هێلى بەرگرين دژى ميكرۆبەكان بە هەموو جۆرەكانيەوە.

15- بڕى ووزە لە شيرى دايك 75 كيلۆ كالۆرى/ يەك ميليلتر لە شيرى ووشك 66 كيلۆكالۆريە.[1]

---

1– RuthA.Lawrence. *Breast Feading*. P: 100, 617

لەو ساڵانەی دوایی دەست کرا بە بانگەشە بۆ شیری ووشك بەکارهێنان لە جیاتی شیری دایك، بە تایبەتی بۆ ئەو ئافرەتانەی کە لە دەرەوە کار دەکەن وەك چارەسەرێك بۆ منداڵە شیرەخۆرەکەیان. بەڵام ئەو بڕیارە بڕیارێکی ڕاست ودروست نیە، چونکە جیاوازی زۆر هەیە لە نێوانیان هەروەك بە درێژی باسمان کرد. ئەوەش زولمە لەو منداڵانە دەکرێت کە بێ بەش دەبن لەو نیعمەتە کە هەموو پێداویستیەکی منداڵی تیایە لە ڕووی خواردن وخواردنەوە.

## بەندی سێیەم: سوودەکانی شیری دایك (فوائد الرضاعة للطفل وللأم)

### بڕگەی یەکەم: سوودەکانی شیری دایك بۆ منداڵەکەی

1- شیری دایك هەموو کات ئامادەیەو لەپلەیەکی گەرمی دروست، پالاوتن و پاککردنەوەی ناوێت.[1]

2- لە سێ ڕۆژی یەکەمی دوای منداڵبوون شیرێکی زەرد شیر دێتە خوارەوە بە ناوی (ژەك- اللبأ Clostrum)؛ کە بڕێکی باش لە پرۆتینی سووك هەرسی تیایە، لەگەڵ کەمێك شەکر. بڕێکی دژەتەن، ڤیتامینی زۆریشی تیایە ئەوانەش وا دەکەن بەرگری لەش زیاد بکەن دژی میکرۆبەکان. هەروەها هەندێ ماددەی وای تیایە کە هاوکارن بۆ ئەوەی منداڵەکە تووشی باوبڕو قەبزی نەبێت.[2]

---

- *Christor Badcock K,T.J . Evolutionary psychology. P: 215, 216.*
- *James Akre. Infant Feeding. P: 74,207.*
- *John.W.Hole, JR . Human Anatomy&Physiology. P:839*
- *Stuart&Cristoph lees. Obstetric by ten teachers. P: 143.*
- البار، محمد علي ، خلق الإنسان بين الطب والقرآن، ص413 .
- عبد العزيز، محمد كمال، الرضاعة والفطام في الطب والقرآن، ص31 .
- محاضرات طلبة الدكتوراه في كلية الطب للاستاذة شذى.

1_ *Stuart &Cristoph lees. Obestetric by ten teachers. P: 151.*

2 _ *RuthA.Lawrence. Breast Feading. P: 100.*

- *Christor Badcock K,T.J . Evolutionary psychology. P: 216.*

3- بڕى ئەو پرۆتين وشەكرو چەوريەى تيايەتى گونجاوە بۆ منداڵەكە، هەموو پێويستيەكانى دابين دەكات، بەڵام بڕى ئەو پێكهاتانە لە شيرى ووشك گونجاوە بۆ كۆرپەى ئەو گياندارانەى كە شيرەكەيان لێ وەرگيراوە نەوەك بۆ كۆرپەى ئادەميزاد.

4- شيرى دايك پێويستە بۆ گەشەى خانەكانى مێشك وتۆرەى چاو، هەروەك باسمان كردن.[1]

5- ئەو منداڵانەى شيرى ووشك دەخۆن، تووشى مردنى كتوپڕ دەبن (موت المهاد- Cod death) ، بەڵام لەوانەى شيرى دايك دەخۆن ئەو دياردەيە نيە.[2]

6- گەشەى ئەو منداڵانەى شيرى دايك دەخۆن باشترو خێراترە لەگەشەى ئەوانى تر.

7- ئەو منداڵانەى كە شيرى دايك دەخۆن كەمتر تووشى ئەو نەخۆشيانە دەبن: نەخۆشيەكانى گەدەو ريخۆڵە، حەساسيە- ئيكزيما وتەنگە نەفەسى- (الربو)، شەكرەى منداڵى (جوڤينايل-Juvenile DM)، هەوكردنى ماسولكەى دڵ، شێرپەنجەى مەمك، نەكەوتنە بێ نوێژى- (Amenorrhea) ، كۆرپەلەى پێش وەختى (Preterm babies)، ژمارەيەك لە هەوكردنى كۆئەندامى هەناسە و ميزەڕۆ، سكچوون، شێرپەنجەى ليمفە گلاندەكان (هۆشكن)، ڕۆماتيزم، هەوكردنى گوێچكەى ناوەڕاست ، هەوكردنى ڕژێنەى دەرەقى ( Autoimmune thyroid diseses ) ، هەروەها نەخۆشى ( Multiple seclerosis , Celiac disease Chrons disease )[3].

8- گەشەى دەرونى (النمو النفسي): ئەو منداڵانەى كە شيرى ووشك دەخۆن زياتر تووشى پشێوى دەرونى ونەخۆشيە نامۆكانى دەرونى و نەخۆشى (الانفصام

---

1 _ Christor Badcock. E volutionary psychology. P: 215
- James Akre. Infant Feeding. P: 74, 207.

2_ البار، محمد علي ، خلق الإنسان بين الطب والقرآن، ص413 .

3_ RuthA.Lawrence. Breast Feading. P: 617.
- Stuart &Cristoph lees. Obestetric by ten teachers. P: 151.

الشخصي- Schizophrenia ) دەبن.[1]

9- شیری دایك لە ڕووی ئابوریەوە زۆر هەرزان ترە لە شیری ووشك.

10- شیری دایك بەکتریا باشەکانی ناو ڕیخۆڵە (Intestinal Flora ) گەشە پێدەکات، کە ڕۆلێکی سەرەکیان هەیە لە زیاد کردنی مژینی کانزاو ڤیتامینەکان، بە پێچەوانەوە شیری ووشك زۆربوون وگەشەی ئەو بەکتریایانە دەشێوێنێ.[2]

11- ئەو بڕە لاکتۆزەی هەیە لە ناو شیری دایك ووزەیەکی تەواو دەبەخشێتە منداڵەکە، هاوکاریشە بۆ دەرپەڕاندنی ماددە ژەهراویەکانی ناو لەش، دروست کردنی پرۆتینەکانی بەشدارن لە دروست کردنی خانەکان.[3]

12- مژینی مەمکی دایك وا دەکات گەشەی ددان وپووك وشەویلاکی منداڵە تەواوو دروست بێت.

13- کەمتر تووشی قەڵەوی دەبن.

14- کەمتر تووشی بەدخۆراکی دەبن، بەمەش ڕێژەی مردن لەو منداڵانە کەمترە.

15- شیرپێدان ماوەی نێوان سك پڕیەکان زیاد دەکات، ئەمەش وا دەکات منداڵەکە تێر شیرو خواردن بێت.

16- کەمتر تووشی نەخۆشیە درێژخایەنەکان دەبن لە دواڕۆژ، وەك: نەخۆشی شەکرە وبەرزی پەستانی خوێن.

---

*1 – Stuart &Cristoph lees. Obestetric by ten teachers. P: 151.*

2ـ عبد الحميد دياب وأحمد قرقور، مع الطب في القرآن الكريم، ص100-101.

3ـ عبد العزيز، محمد كمال، الرضاعة والفطام في الطب والقرآن، ص31 .

## بڕگەی دووەم: سوودەکانی شیر پێدان بۆ دایك (فوائدالرضاعة للأم)

1- پەیوەنـدی دەروونـی وعـاتیفی نێـوان منـداڵ ودایـك باشـترین هۆکـاری جێگیربوونی دەروونیە بۆ هەردووکیان، بە تایبەتی دوای یەك ساڵ لە شیر پێدان.[1]

2- گەڕانەوەی منداڵدان بۆ باری ئاسایی خۆی بە کاتێکی کەمتر، چونکە مـژینی مـەمك لەلایـەن منداڵەکـەوە دەبێتـە هـۆی ڕژانـدنی هۆرمـونی ئۆکـسیتۆسین (Oxytocin) لـە ڕژێنەگلانـدی ژێـر مێـشك، ئـەویش هۆکـارە بـۆ کرژبوونـەوەی ماسولکەکانی منداڵدان وگەڕانەوەی بۆ باری ئاسایی خۆی. ئەو کردارەش بەرگریـە لە بەردەم هەوکردنی منداڵدان وتای زەیستانی(Perpurial sepsis).

3- شیرپێدان هۆکارە بۆ کەم کردنـەوەی تـووش بـوونی دایك بـە شـێرپەنجەی مەمك. هەروەك لە لێکۆڵینەوەیەکدا هاتووە کـەوا ئەوانـەی شـویان نـەکردووە زیـاتر تووشی ئەو نەخۆشیە دەبن لەوانەی کە شویان کردووە.[2]

4- شیرپێدان ڕێگایەکی سروشتیە بۆ ڕێگەگرتن لە سك پـڕی، کـە پێویـستی بـە دەرمان ودەرزی ودانانی لەولەب نیە.

میکانیزمی ئەو بەرگری کردنەش ئەوەیە: مژینی گۆی مەمك لەلایەن منداڵەکـەوە دەبێتە هۆی ڕژاندنی هۆرمونی پرۆلاکتین لە لە ڕژێنەگلاندی ژێـر مێـشك، ئـەویش وا دەکات دەرهاویشتنی شیر لە مەمکەکان زیـاد بکـات، لـە هـەمان کـات پـرۆلاکتین وا دەکـات ئاسـتی ئـەو هۆرمونانـەی هاوکـاری گەشـەی هێلکـەن لـە هێلکـەدان کـەم بکاتـەوە، ئـەویش بـە هـۆی کـەم بوونـەوەی وەڵامـی ڕژێنەگلانـدی ژێـر مێـشك بـۆ هۆرمونی (GnRH)، یان پوچەڵ کردنەوەی کاری ئەو هۆرمونە، یان لە ڕێگەی کەم کردنەوەی بـڕی هۆرمـونی ئیـسترۆجین وپرۆجیـسترون، کـە هـەردووکیان هۆرمـونی

---

*1 — Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 210.*
*- Margret Cameron. Manual on Feeding Infant&Young Childern. P: 84.*
*- Lars.Hamberger. Achild is Born. P: 171.*
*2— RuthA.Lawrence. Breast Feading. P: 219.*

سەرەکی گەشەی هێلکەو پیتێن وکۆرپەلەن. بەم شێوەیە هێلکە پێناگات ونایەتە خوارەوە بۆ پیتێن هەرچەندە گەر بەیەك گەیشتن هەبێ لە نێوان هەردوو هاوسەرەکە.[1] بەم ڕێگە سروشتی یە بۆ ماوەی دوو تا سێ ساڵ بەرگری لە منداڵبوون دەکرێت، ڕێژەی سەرنەکەوتن تیایدا 3% یە. قەدەر وبڕیاری کۆتایش لە دەست خودایە.[2]

5- کەم کردنەوەی تووش بوونی بە داخوڕانی ئێسقان (Osteoporosis) بە هۆی زیاد بوون وبەرز بوونەوەی بڕی کالیسیوم و فۆسفاتی ناو خوێن.[3]

لەبەر ئەو سوودانەی باسمان کردن ئاینی ئیسلام واجبی کردووە لەسەر دایك وباوك شیری ئافرەت بدەنە منداڵەکەیان جا شیری دایکی منداڵەکە خۆی- کە زۆر باشترە- بێت یان ئافرەتێکی تر، گەر دایکی نەیتوانی شیر بداتە منداڵەکەی لەبەر هەر هۆکارێك. هەروەها زانایان فەرموویانە لەسەر باوك واجبە شیری ئافرەت بۆ منداڵەکەی دابین بکات گەر دایکی قەدەغەی کرد. هەروەها فەرموویانە(شافعیەکان) گەر باوکی ئەو منداڵە نەیتوانی ئافرەتێك پەیدا بکات شیری بداتێ، یان منداڵە مەمکی ئافرەتی تری وەرنەگرت، ئەوا دەبێ ئافرەتەکە(واتە دایکی منداڵەکە) ناچار بکرێت شیر بداتە منداڵەکە، بەتایبەتی لە ڕۆژی یەکەم ودووەم وسێیەم لەو کاتەی کە شیرەکە (ژەکە).[4]

لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا ئافرەت لە ئیسلامدا سەربەستی زۆری هەیە، دەتوانێ شیر نەداتە منداڵەکەی، هاوسەرەکەی ناچار دەبێت ئافرەتێك بە کرێ بگرێت بۆ ئەو کارە. هەرچەندە ئەو جۆرە هەڵوێستانە لە ئافرەتی موسڵمان وبەسۆز بەرامبەر جگەر گۆشەکەی دوورە، هەروەها زیانی زۆرە بۆ خۆی وبۆ

---

*1 —— Leon Speroff. Clinical Gynecologic Endocrinology & Infertility. P: 290.P: 216.*

*2 — Leslie.J.Degroot Endocrinology. P:3/2074*

- عبد الحميد دياب، مع الطب في القرآن الكريم، ص102. والبار، خلق الإنسان، ص:415.

*3 — RuthA.Lawrence. Breast Feading. P: 226.*

4 — الهيتمي، أبو العباس، أحمد بن محمد، تحفة المحتاج بشرح المنهاج، 598/3.

منداڵەکەی، بەڵام لەوانەیە ئافرەتی وا هەبێت ئەو جۆرە هەڵوێستانەی هەبێت.

هەروەها ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەوا ئاینی ئیسلام چۆن گرنگی بە تەندروست وگەشەی منداڵ دەدات، چونکە خولقێنەر خۆی دەزانێ چی بۆ جەستەو دەرونی ئەو مەخلوقە باشە ئەوانە بڕیار دەدات. بۆیە ئیسلام بڕیاری داوە کەوا ماوەی دوو ساڵ (دایك) خۆی شیری منداڵەکەی بدات لەبەر ئەو سوودانەی باسمان. چونکە ئەو ماوەیە گەشەی مێشك و دارێژانی باری دەرونی منداڵەکە دەست پێ دەکات و کاریگەری هەیە لەسەر هەڵسوکەوتی لە پاشەڕۆژدا.

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ البقرة: 233، واتە: دایکان دوو ساڵ شیری منداڵەکەیان دەدەن گەر بیانەوێ شیرپێدانی تەواوو دروست بکەن.

دوای شیر پێدان، پەروەردەی منداڵ و چاودێری کردنی دێتە پێشەوە کە زۆر قورسترە لە شیر پێدان. ئەوانەی دەیانەوێت سەر لە کۆمەڵگە بشێوێنن دوای بانگەشە کردن بۆ چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن، شیری ووشك و خانەی ساوایان خستە بڕی(البـديل)و ئالتەرناتیڤی شیری دایك وباوەشی گەرم وسۆزو عاتیفەکەی وپەروەردەکردنی لەسەر ڕەوشت وداب ونەریتی کۆمەڵگەو فێرکردنی چۆنیەتی ڕێزگرتنی لە دایك وباوك، لە بەها بەنرخەکان، لەوانەی لە خۆی گەورەترن. هەرچەندە باش دەزانن کە ئەو دوو کردارە زۆر لێك دوورن و هەرگیز یەکسان نابن. چونکە ئەو منداڵەی دوور لە ئامێزی دایکی وسۆزو عەتفی گەورە دەبێت منداڵێکی ئاسایی نابێت لە هەڵسوکەوتی دا، تووشی لادان وسەرلێ شێواوی دەبێت، چوونە ناو کارە دژوارو ترسناکەن لای زۆر ئاسانە، چونکە لەناو سۆزو عاتیفە گەورە نەبووە بەڵکو لەناو هاوارو لێدان وتورەبوونی بەڕێوەبەرانی ئەو خانەی ساوایانە پەروەردەکراوەو گەورە بووە.

لێکۆڵینەوە زانستیەکان لە ئەمەریکا سەلماندوویانە ئەو منداڵانەی گەورە دەبن لە باخچەی ساوایان لە ژێر چاودێری بەخێوکەرانی ئاین، ڕەوشت وئارەزو، داب

وبەریت جیاوان، ئەوا منداڵی میزاج گۆڕاو، بێ هێز، هەڵگەڕاوەیان لێ دەردەچێت (ill-tempered children). کاتێ دەگەنە تەمەنی گەنجی زیاتر تووشی نەخۆشی دەروونی دەبن، بەئاسانی ناتوانرێ کۆنترۆڵی میزاجە گۆڕاوەکەیان بکرێت، ئاستی زانستیان نزمترە لەوانی تر، باری ئابوری وکۆمەڵایەتی یان بە شێوەیەکی پلەیی دادەبەزێ، شوێنی کاری زوو دەگۆڕێ، پەیوەندی کۆمەڵایەتیان لاوازە، زۆر جاریش ئارەزووی لە ژیانی تەنهایی یە. ڕێژەی تەڵاقیش لەو چینەدا دوو بەرابەری خەڵکی ترە و دەگاتە 40%. سەبارەت بە ئافرەتانیشەوە دەبینین پەیوەندی کۆمەڵایەتیان لاوازە، کێشەی خێزانی زۆرە، ڕێژەی تەڵاق دەگاتە 26% بەرامبەر بە12%لە ئافرەتانی تر.[1]

پاش ئەو هەموو نەهامەتیەی بەسەر ساوایان ومنداڵانی وڵاتانی ڕۆژئاوا دا هات دەبینین لە کۆتایدا ناچار بوون بگەڕێنەوە سەر ئەو بڕیارانەی کە خوای گەورە بە ڕەحمەت بۆ مرۆڤایەتی ناردووە. هەروەك هەموو پزیشکانی بەڕێز ئاگادارن کەوا ئێستا لە ئەمەریکا بە تایبەتی ولە ڕۆژئاوا بە گشتی بۆتە ئەرك وفەرمان وواجبی حکومی کەوا دەبێت ئافرەتان ڕاستەوخۆ دوای منداڵبوون بە نیو کات ژمێر شیر بدەنە منداڵەکەیان، دوای بەردەوام بن تاوەکو شەش مانگی یەکەم وەك فەرمانێکی چەسپاوی بەزۆر (ئیلزامی)، ئەوانەی توانای ئەوەیان هەیە بۆ ماوەی دوو ساڵ شیر بدەنە منداڵەکەیان ئەوا پاداشت وخەڵاتی دەکەن.

لێرەوەش دووبارە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا ئەی موسڵمان ئاگاداربە ئێمە هەموو بەرنامەیەکمان هەیە لە بچوکترین شت بۆ گەورەترین، بەبێ ئەوەی پلەی زانستیمان گەیشتبێ بە زانینی سوودەکانی ئەو بڕیارو یاسانە، تۆ پیادەی بکە لە ژیانی ڕۆژانەت زەرەرمەند نابیت چونکە لەلای خوای بەزەیەوە هاتووە کە هەردەم چاکەی دەوێت بۆ بەندەکانی.

هەروەك بینیمان ڕۆژئاوا پاش لێکۆڵینەو ماندوو بوونێکی زۆر وکات بە فیڕۆ دانێکی زۆر گەیشتنە هەمان بڕیاری ئێمەی موسڵمان لە بابەتی شیری دایك

---

*1 — Hilgard Psychology. P: 440*

وسوودەکانی بۆ هەردووکیان. کەواتە ئاگادار بە هەرچەندە خەلکان پلەی زانستیان بەرزبێ وپێشکەوتووبن ناتوانن بگەنە پلەی زانستی خوای گەورە تاوەکو بڕیارمان بۆ بدەن ویاسای ژیانمان بۆ دارێژن. هەروەها ئاگاداربە ئەوەی بۆمان دێت یان بۆمان دەنێرن هەمووی هەر باش نیە، باوەڕ بکەن زۆربەی ئەوانەی بۆمان دێت لە بەرنامەو یاساو بڕیارو بەسەرمانی دا دەسەپێنن زۆری لای خۆیان کاری پێناکەن وکاریگەری نەماوە- ئیکسپایر(قـد انتهـى مفعولـه- Expire ) بووە، بەلام دەیانەوێت ئێمەی هەژار چەواشە بکەن ولە بەرنامەی خوای گەورە دوورمان بخەنەوە ونەو زیانە کۆمەلایەتی وئابوریەی خۆیان کردوویانە ئێمەش بە زۆری زۆرداری بیکەین، ئەو نسکۆو فەشەل بوونەی خۆیان بشارنەوەو پێمان بسەلمێنن کەوا ڕاستە، بلێن ئەوا نابینن لە گشت وولاتانی جیهانی سێیەم کاری پێدەکرێت، ئێوەش چاو لەوان بکەن وبیری خۆتانی پیوە ماندوو مەکەن چونکە ئێوە زانستتان نیە وتەنها ئێمە هەمانە. بەلام دەبێ بزانن کەوا خوای گەورە زانیاری زۆر کەمی داوەتە ئادەمیزاد و خۆشی لەسەروی هەموو زانایانە.

خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات کە بخوێنین وزانست فێربین بەلام بەرنامە دانان وبڕیار بەدەست خودایە، چاولێکەری دوژمنان وبێ باوەڕانیشی لە کاروبارەکانی کۆمەلایەتی و خوڕەوشت وئاداب و دانانی یاساو بڕیار قەدەغە کردووە، چونکە هەرگیز چاکەی موسلمانانیان ناوێت.

## بەندی چوارەم: حوکمەکانی شیرپێدان (أحكام الرضاعة)

ئافرەتی سك پڕو شیردەر گەر ترسان لەگیانی خۆیان ئەوا تەنها ڕۆژوەکان دەگرنەوە،بەلام گەر لەگیان منداڵەکەیان ترسان ئەوا ڕۆژوەکە دەگرنەوەو فدیەش بدات.[1]

بۆ سەلماندنی ئەوەی ئافرەتێك شیری داوەتە یەکێك ئەوا پێویستی بە شایەتی دوو پیاو، پیاوێك ودوو ئافرەتێك، چوار ئافرەت، یان شایەتی ئافرەتەکەی

---

1ـ النووي، سراج الوهاج، ص143.

